

# توندڕەوی

# ئیرهاب

# گۆڕینی جیهان

فاضل قەرەداغی



١٤٢١ - کۆچی ٢٠٠٠ زاینی

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم بابەتە بە دوو بەش لە گۆڤاری (رابوون)دا بڵاوبۆتەوە:
١-ژمارە(٣) ، موحەڕڕەم/صەفەر١٤٢١، ئایار/حوزەیران ٢٠٠٠
٢-ژمارە (٤) ، رەبیعی یەکەم/ رەبیعی دووەم ١٤٢١، تەمموز/ئاب ٢٠٠٠

---

# توندڕەوی.. ئیرهاب.. گۆڕینی جیهان

فاضل قەرەداغی

١٤٢١ک-٢٠٠٠ز

# بەشی یەکەم

## با هەنگاوی هەڵە نەنێین

ڕاستی سوودی بۆ هەموو مرۆڤێك هەیە. خۆگێل کردنیش لەراستی هەڵەیەکی گەورەیە. ئێمەی ئیسلامی زیان بەخۆمان دەگەیەنین ئەگەر نکوڵی لەهەبوونی توندڕەو لەناو ریزەکانماندا بکەین. عەلمانییەکانیش زەرەر دەکەن کاتێك تۆمەتی ئیرهاب وتوندڕەوی لەخۆیان دووردەخەنەوە و ئاراستەی ئیسلامییەکانی دەکەن.

عەلمانییەکان دەبێت بەلای کەمەوە بنەمای (دوژمنی خۆت بناسە) بخەنە کار وئیسلامییەکان بناسن. دووبارەکردنەوەی تۆمەتی توندڕەوی وئیرهاب چەواشەتریان دەکات وناهێڵێت بابەتییانە ئیسلامییەکان بناسن.

خۆخەڵەتاندن هەنگاوی یەکەمی هەڵەیە. باسکردنی توندڕەوی وئیرهاب پەیوەندیی بەلێکۆڵینەوەی زانستییەوە نەماوەو چۆتەخانەی زانستی پروپاگندە.

تێگەیشتنی هەڵە مامەڵەی هەڵەی بەدواوەیە" لەمەشەوە هەڵوێستی جۆراو جۆرمان هەیە:

١- ئیسلامی هەن دیفاع لەهەموو دیاردەی ((توندڕەوی)) دەکەن.

٢- عەلمانیی زۆر هەن مەبەستیان تەنها تەشهیرکردنە بەئیسلامییەکان.

٣- ئیسلامی هەن بۆ دوورخستنی تۆمەتی توندڕەوی لەخۆیان تەنازولی زۆر دەکەن.

٤- عەلمانیش هەن خاوەن ئینسافن بەڵام بزانن یان نەزانن ئیسلام ملکەچی مەفهوومەکانی خۆیان دەکەن.

لەنێوان ئەم هەڵوێستانەش هەڵوێستی جۆراو جۆر هەن... هەڵوێستی دروستیش تاك وتەرا دەبینرێت.

## توندڕەوی لای موسڵمانان

بالێرەوە دەست پێبکەین.ئایا ئیسلام فەرمانی بەتوندڕەوی وئیرهاب داوە؟ئایا فەرمانی پێ نەداون بەڵام ڕێگەیان بۆخۆش دەکات؟ئاڕێگەیان لێ دەگرێت؟ئوممەتی ئیسلام ئوممەتێکی (ناوەڕاستە).﴿وكذلك جعلناكم امة وسطاً﴾ئیعتدال ومیانڕەوی تایبەتییەکی ئیسلامە. ڕۆچوون ڕەوا نییە: هلك المتنطعون. پێغەمبەر (ﷺ) سێ جار ئەمە دووبارە دەکاتەوە: ڕۆچووەکان تیاچوون [1].

بەڵام ئیسلام هەروا واقع بینە: پێویستە بەرزە: پێویستە ئەو هێزە لە پێناوی هەقدا بەکاربێت: کوشتنی ئافرەت، منداڵ، پەککەوتە قەدەغەیە. هێز لەپێناوی پەیامەکەیە، پەیامەکەش بۆ دادپەروەرییە.

زووتر کۆمەڵە جۆراو جۆرەکانی خەوارج هەبوون. توندڕەویی ئەوان گەیشتبووە رادەی رشتنی خوێنی حەرام. بەڵام کەس ئەمان بەنوێنەری ڕاستەقینەی موسڵمانان نازانێت. (اهل السنه والجماعه) ئەوان بەلادەر دەزانن.

خەوارج صەحابییان لەناودا نەبوو. تەنها قورئانیان لەبەردەمدا بوو. لەئیسلامدا قورئان سەرچاوەی یەکەمە بەڵام مرۆڤی موسڵمان بەپاڵ قورئان پێویستی بەسوننەتە. سوننەتیش لای صەحابیەکاندا هەبوو و خەوارج لێی بەش بوون. تەنها یەك ڕووداو دەهێنینەوە وەك نموونە: (یزید الفقیر) دەڵێت خۆم وکۆمەڵێك کەس نیازمان بوو بانگەواز بۆ مەسەلەیەکی خەوارج بکەین (ئەویش ئەو کەسەی دەچێتە دۆزەخ ئیتر قەت نایەتە دەرەوە لێی). بەر لەوەش چووین بۆ حەج کردن ولەوێدا هاوڕێیەکی پێغەمبەرمان بینی فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە کەپێچەوانەی بۆچوونەکەمان بوو. وتم بۆچی درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە دەکەیت، صەحابییەکەش (کەجابر کوڕی عەبدوڵڵا بوو) وتی: قورئانت خوێندووە؟ وتم بەڵێ، وتی: ئەم ئایەتەت خوێندووە (عسی ان یبعثك ربك مقاما محمودا)؟ وتم: بەڵێ، (جابر)یش لەراڤەی ئەو ئایەتەدا باسی ئەو فەرموودەیەی کرد کەکەسانێك لەدۆزەخ دەهێنرێنە دەرەوە... (یەزید) دەڵێت ئێمەش گەڕاینەوە وتەنها یەك کەسمان لەسەر باوەڕی خۆی سوور بوو [2].

بەم شێوەیە ئەو کۆمەڵە قورئانیان خوێندبووەوە بەڵام نەیاندەزانی ئەو (مقام محمود)ە چییە. پێغەمبەریش (ﷺ) ئەمەی ڕوون کردبووەوە. پاش ئەو سەردەمە سوننەت بەوڵاتاندا بڵاوبووەوە و زۆر لەهەڵوێستە هەڵەکان گۆڕان. بەڵام تێگەشتنی هەڵە هەر مابوو.

تێگەیشتنی هەڵە لەلایەك وزوڵمی دەوڵەتی ئەمەوی لەلایەكی تر خەوارجی رووەو توندڕەوی برد. بەڵام تێگەیشتنی هەڵە هەروەها شلڕەویشی بەرهەم هێنا.

خەڵكیش تەنها رووی توندوتیژی دەبینن ئەگینا شلڕەویش توندڕەوییە بەواتای وشە عەرەبییەكە (تطرف). هەردوو هەڵەكەش" توندڕەوی وشلڕەوی ئەنجامی لادانن لە (سكە)ی راستەهێڵەكە :(قورئان و سوننەت). ئارەزووش هۆی یەكەمی ئەو لادانەیە.

لەگەڵ هەموو ئەو توندڕەوی و خوێنرشتنەی خەوارج بەرپایان كردبوو هێشتا كارەكانیان لە چاو توندڕەویی غەیری موسڵمانان كەمە، تەنانەت خەوارج بەلادانەكەی خۆشیانەوە درۆیان نەدەكرد، شیخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە دەڵێت: خەوارج راستگۆترین كۆمەڵن لەو كۆمەڵانەی شوێنی ئارەزوو كەوتوون.

هەرچەندیشە توندڕەوی لە ناو ریزی موسڵماناندا هەیە بەڵام ئیسلام ژمارەیەك بەهای بەرزی لەناو دڵاندا چاندووە كە لەو توندڕەوییە كەم بكاتەوە ئەویش ئەگەر لەگەڵ توندڕەویی غەیری موسڵمانان بەراوردی بكەین.

## توندوتیژی دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە

توندڕەوی تایبەت نییە بە كۆمەڵگەیەك بەتەنیا، بیروباوەڕە باوەكان دەور دەبینن لە كەم كردن یان گەورەكردنی ئەو توندڕەوییە بەڵام توندوتیژی هەر دەمێنێت.

لای هیندۆسییەك كوشتنی مانگا و مشك و مار.. گوناهە بەڵام هەندێك هیندۆسیمان بین كوشتنی مرۆڤی موسڵمان بە حەڵاڵ دەزانن، دەبوایە هیندۆسییەكان ئەمەیان نەكردایە، دەشبوایە كۆمەڵەكانی ئاژەڵ پارێزی نەرمترین كۆمەڵ بوونایە بەڵام كۆمەڵێ وا لە رۆژئاوادا بینراون تاقیگە پزیشكییەكان دەتەقێننەوە و دكتۆر دەكوژن چونكە تاقیكردنەوە لەسەر ئاژەڵدا دەكەن (بڕوانە بەشی دووەمی ئەم باسە).

بە كورتی هیچ كۆمەڵگەیەك لە توندڕەوی و ئیرهاب بێبەش نییە، رۆژئاواش كە زۆر شتی باشی بۆ خۆی ئیحتكار كردووە دەیەوێت ئیحتكاری ئیرهاب بۆ رۆژهەڵات و بەتایبەتی بۆ موسڵمانان بێت.

## كێشەی پێناسە

وەسف كردنی كەسێك یان لایەنێك بە توندڕەو و بە ئیرهابی یان میانڕەو وەك وتمان پەیوەندی بە زانستەوە نییە بەڵكو بە پڕوپاگندە ، بۆیە تا ئێستا پێناسەیەكی وا بۆ ئیرهاب نییە جێگەی رەزامەندیی هەموو لایەك بێت، پێناسەیەك هەیە دەڵێت كە ئیرهاب:

بریتییە لە بەكارهێنانی توندوتیژیی نایاسایی یان هەڕەشە كردن بەبەكارهێنانی ئەو توندوتیژییە ئەویش بە هەموو جۆرەكانی وەك كوشتن و شێواندنی لاشەو ئازاردان و تێك دان (...) بە شێوەیەكی گشتیش بریتییە لە بەكارهێنانی زۆرە ملێكردن بۆ ملكەچ كردنی نەیار بۆ خواستی لایەنە ئیرهابییەكە [٣].بەڵام با پرسین:

١- وشەی نایاسایی چی دەگرێتەوە؟ كام یاسا؟ هەتا ئەگەر یاسایەكی ناڕەوا بێت؟ ئەی یاسای رەواو ناڕەوا كێ دیارییان دەكات؟

٢- بەكارهێنانی زۆرەملێكردن (إكراه) شتێكە هەموو دەوڵەتەكان ئەنجامی دەدەن بەڵكو تەنانەت بە شێكە لە پێكهاتەكانی دەوڵەت و مەسەلەیەكی لای هەمووان پەسەندە. ئەمە بۆ زۆرەملێی ((رەوا)) جگە لەمەش جۆرەكانی تری زۆرەملێكردن پیادە دەكرێن: داگیركردنی وڵاتان، دەستخستنە ناو كاروباری وڵاتان، سەپاندنی بیروباوەڕ... هیچیشیان وەكو ئیرهاب ناونەبراون.

پێناسەیەكی تر وشەی (نایاسایی) بەكارناهێنێت. پێناسەكە دەڵێت ئیرهاب:بەكارهێنانی توندو تیژی یان هەڕەشە كردنی بەكارهێنانی توندوتیژییە بۆ بەجێهێنانی ئامانجە سیاسییەكان[٤] پێناسەیەكە لەسەددا سەد هەڵەیە چونكە بەم پێیە هەموو جەنگەكانی جیهان ئیرهابین، ئەی (كلاوزڤیتز) لەبارەی جەنگەوەنەیوتبووكە جەنگ (درێژەپێدانی كاری سیاسییە لەرێگەی دیكەوە) [٥]؟ وەسفێكە جێگەی قبووڵی زۆر كەس بوو.

پێناسەیەکی هاوشێوە هەیە بەڵام تەعبیری ((بەکارهێنانی توندوتیژی بە شێوەیەکی مەنهەجی)) بەکار دەهێنێت و ئامانجەکان بە تەنیا سیاسی نازانێت [٦] دەشڵێت کەوا ئیرهاب ڕێگەیەکی پێکاچوونە لە ململانەی نێوان هێزو و گروپی کۆمەڵایەتی زیاتر لەوەی نێوان تاکەکەسەکان بێت و بۆی هەیە لە هەموو نیزامێکی کۆمەڵایەتیدا رووبدات [٧].

ئەم پێناسانە جێدەهێڵین و دێینە سەر زاراوەیەکی سەیر کە لە ئەدەبیاتی سیاسی و فیکریی کوریدا بلاوبۆتەوە ئەویش ((توندڕەوی)) یە، (توندڕەوی) بەرامبەر (تطرف)ی عەرەبی نییە، (توندڕەو) بەزۆری بۆ ئەو کەسانە بەکارهێنراون کە توندوتیژی پیادە دەکەن ، پێناسەیەکی هەڵەیەو لە هیچ فەرهەنگێکی سیاسیدا نییە و بێ سوودە بەدوای پێناسەیەکیدا بگەڕێین، هەرچەندە لەبەر نەبوونی بەدیلێك ناچارین بەکاری بهێنین.

جگە لە مانە زاراوەی ئوسوڵیەت (Fundamentalism) هەیە کە جیایە لە (تطرف) بەڵام لەگەڵ ئەودا پەیوەست کراوە . ئوسوڵیەت وەك مەوسوعەیەکی ئەمەریکی دەڵێت ناوێك بوو بۆ بزاڤێکی پارێزگاری خەباتگێڕ کە دەیەکانی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی لەناو کەنیسەی پرۆتستانتی لە ئەمەریکادا گەشەی کرد بوو، بە شێوەیەکی سەرەکێش لە کەنیسەکانی باپتست (Baptist) (مەعمەدانی) و دیسایپل (Disciple) و پریسبیتاری (Presbytarian) خۆی نیشان دابوو بەڵام هەروەها پشتیوانییەکی باشی هەبوو لەکۆمەڵەکانی تری سەر بە کەنیسەکان.ئەم بزاڤە کۆششی کردبوو بۆ سەپاندنی بیروباوەڕەکانی بەسەر کەنیسەکاندا و بەسەر جەماوەر و قوتابخانەکانی تایبەت بە تایفەکاندا [٨].

بنەماکانی ئەو ئوسوڵیەتە پێنج خاڵ بوون: عیسمەتی تەورات، لە دایك بونی پاکیزەی مەسیح، ئازارو مردنی مەسیح بە شێوەیەکی سەروو سروشتی، گەڕانەوەی مەسیح بەلەش بۆ ژیان، پێنجەمیشیان ئەوەیە موعجیزەکانی ئینجیل جێگەی باوەڕن [٩].

لێرەدا پێناسەیەکی گونجاو بۆ ئوسوڵیەت هەیە چونکە وەسفی دیاردەیەك بوو کە لەوجوددا هەبوو بەڵام کاتێك نۆرەی ئیسلامییەکان هات ناوەکەیان لێ نرا بێ پرسیارکردن لە پێوانەیەك بۆ ئوسوڵیەتی ئیسلامی.

ئیسلامییەکان و موسڵمانان لە غەیری ئیسلامییەکان لەسەر ژمارەیەك بنەما ڕێکن، کەواتە هەموو موسڵمانان ئوسوڵین.

ئوسوڵیەت زاراوەیەکی رۆژئاواییە وپێمان دەفرۆشرێت، بەوەش دەزانین کە بەکارهێنانی زاراوەکە بۆ ئێمە کارێکی پروپاگندەیە نەك زانستی کاتێك بزانین ئوسوڵیەت لای رۆژئاوا جێگەی رەزامەندی نییە، چونکە وشەکە رۆژانی ئەوسای دەمارگیریی ئایینیی رۆژئاوا دەهێنێتەوە یاد، لەمەش زیاتر دڵنیا دەبین کاتێك بزانین کە لە ئەمەریکادا و بە پێچەوانەی ئەوروپا وشەکە (ئەوەندەی من بزانم) بۆ ئیسلامییەکان زۆر بەکارنایەت ئەویش چونکە بزاڤی ئوسوڵی لە ئەمەریکا دا زۆر بەهێزە و بەکارهێنانی وشەکە بۆ ئیسلامییەکان جۆرە سۆزێك دروست دەکات لای ئوسوڵییەکانی ئەمەریکا، دەشزانین کە لەبواری پروپاگندەدا مەبەست ناشیرین کردنی نەیارە نەك دروست کردنی سۆز بۆی.

کەواتە هەرلەسەرەتاوە کێشەی پێناسەمان هەیە، ئەمەش وەکو زۆر چەمکی تر: دیموکراسی، سۆشیالیزم، مافی مرۆڤ، عەلمانیەت، ئازادی،... کەپێناسەیەکی زانستیان نییە وتێگەیشتنی هەر یەکێك لەو چەمکانە دەوری هەیە لەپێناسەکردندا ئەمەش بەپاڵ رەچاوکردنی بەرژەوەندی کەلەحاڵەتی پێناسەی ئیرهابدا بەرژەوەندی زاڵترە. ئەوەتا ئەمریکا دیەوێت پێناسەی خۆی بۆ ئیرهاب بسەپێنێت. پێناسە ئەمەریکییەکە ئەو ئیرهابەی دەوڵەت پیادەی دەکات وەلاوە دەنێت، فەرەنسا بەهەمان شێوە ئیرهابی دەوڵەت ناخاتە ناو پێشنیارکەی بۆپێناسەکردنی ئیرهاب [١٠] وەلاوەنانی ئیرهابی دەوڵەت لەبەر ئەوەیە کەئەو دەوڵەتانەی ئیرهاب پیادە دەکەن دەیانەوێت پێناسەیەك بۆ ئیرهاب بسەپێنن کەغەیری خۆیانی پێ تاوانبار بکەن.

## پێوانەیەکی دروست

کەواتە ئیرهابی کێیە؟ چۆن حوکم لەسەر کارەکان بکەین بۆ ئەوەی کەسێك بە ئیرهابی بزانین؟ بۆ ئەم مەبەستە وەسیلەکان یان ئامانجەکان یان بیروباوەڕەکان پێوانەن؟ئەوسا ئیرهاب وشەیەك نەبوو بەرادەی ئەمڕۆ قێزەون بێت.

(رۆبسپییێر)، کە سەرکردەیەکی شۆڕشی فەرەنسا بوو و لەگەڵ هاوڕێکانیاندا حوکمی ئیرهابی لە١٧٩٣- ١٧٩٤ پیادەکردبوو دەیوت کەوا هەردوو ئیرهاب وفەزیلەت پێکەوە پێویستن. ئیرهاب بێ فەزیلەت ئەنجامی خراپی لێ دەبێتەوە وفەزیلەت بێ ئیرهاب بێ دەسەلات دەمێنێتەوە [١١] .

مارکسیش هەڕەشەی لەحکومەت دەکرد ودەیوت:کاێك نۆرەی ئێمە دێت هیچ عوزرێك بۆ ئیرهابەکەمان ناهێنینەوە... [١٢] ئەگەر وشەیەکیش لای خەڵك نەخراپ ونەباش بێت ئاسانە پێوانەی بۆ دابنرێت بەڵام کاتێك بەپێی ئارەزوو یان بەرژەوەندی بەکار بێت گەڕان بەدوای پێوانەیەکی دروست کێشەیەکە چارەسەرەکەی زەحمەتە.

کاتێکیش ((ئێمە)) و ( (ئەوان)) دێتە گۆڕێ پێوانەکان لە مەوزوعیەت دوور دەکەونەوە. نووسەرێکی رۆژئاوایی دەڵێت: جیاوازی نییە نێوان بۆمبێك فرۆکەیەك فڕێی بدات لەگەڵ نارنجۆکێك کەسێك هەڵی بدات بەڵام کاری نارنجۆکەکە لەسەر پیرەژنانی رۆژئاوا گەورەترە وبکەری ئەمیان بەئیرهابی ودەرچوو لەیاسا تەماشا دەکرێت. جیاوازییەکەش لەوەدایە کە قوربانییەکانی ئیرهاب ((لەئێمەن)) –واتە لەرۆژئاوا– لەکاتێکدا قوربانییەکانی بۆ مباکانی فرۆکەکە ( (لەوانن)) – واتە ژێردەستەکان [١٣]. ((ئێمە)) و ( (ئەوان)) پێوانەیەکی نادروستە. ( (ئێمە)) ئیرهابین ئەگەر چیش تاوانەکانمان بچووکتر بن.

## سەپاندنی بیروباوەڕ

مەسەلەکە لەخستنە رووی پێوانەی نادروستدا ناوەستێتەوە بەڵکو بۆ سەپاندنی ئەو پێوانەیە پەل دەهاوێت. دەسەڵاتداران نەك تەنها خۆیان بەسەر لاشەتدا دەسەپێنن بەڵکو دەیانەوێت دەست بەسەر مێشکیشتدا بگرن. ئەو کەسەی لای ئەوان ئیرهابییە دەبێت لای تۆش ئیرهابی بێت.

تەنها دیکتاتۆرە بچووکەکانی ئێمەش نین کە بیروباوەڕەکانیان دەسەپێنن. ئەمەریکا راڤەیەکی خۆی بۆئیرهاب هەیە یان راستر بڵێن هیچ راڤەیەکی وای نییە بەڵکو تەنها لیستێکی هەیە بەناوی دەوڵەت ولایەن وکەسە ئیرهابییەکان لەگەڵ چەند رێنماییەك بۆ ئەوەی نەچێتە ناو لیستەکە کە لەو رستەدا کۆدەبنەوە: دژی ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی مەوەستە.ئەم تۆقاندنە ئەمریکیە ترسێکی دروست کردووە تەنانەت لەبەکار هێنانی هەندێك وشە وەك (جیهاد).

پێویستە پێوانەکانت هەمان پێوانەکانی ئاغای گەورەبن دەنا خۆت بۆ غەزەبی ئامادە بکە. چەند ساڵێك لەمەوبەرو پاش کوژرانی چەند جوولەکەیەك لەسەر خاکی داگیرکراوی فەلەستین کۆنگرەی (شرم الشیخ) دژی ئیرهاب بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا ٢٨ سەرۆکی جیهان بەشدارییان کردو چوونە پاڵ لایەنە بەهێزەکە. لەم لوتکەیەدا ئیدانەی هێرشە ((ئیرهابییەکان)) وبەتایبەتی ئەوانەی دژی ئیسرائیل کراو بە ((نامۆ بەبەها ئەخلاقی و رۆحییەکانی هەموو گەلانی ناوچەکە ناوبران...)) کام بەها؟ جوولەکە خاکی فەلەستینیەکانیان داگیرکردوە و باس لەبەها ئەخلاقییەکان ناکرێت. ئاشکرایە مەبەست لەو بەهایانە چییە! بەهاکانی ئاغا.

بیروباوەڕی ئامادەو پێوانەی سەیر تەنانەت لای ئەو کەسانەش هەن کە ((تێگەشتوون)) ودەمارگیر نین. یەکێك لەوانە پرۆفیسۆری ئەمریکی (جۆن ئیسپۆزیتۆ) کە خاوەنی هەڵوێستی باشە لەموسڵمانان وئیسلامییەکان. ئیسپۆزیتۆ جیاوازی دەخاتە نێوان ئیسلامییە ((میانڕەوەکان)) کە دەکرێت بەشداری بکەن لەگەڵ نیزامەکانداو ((متطرف))ە رادیکاڵەکان کەدەیانەوێت ئەم نیزامانە لابەرن . بەپێی ناوبراو پێویستە ئەم کۆمەڵە رادیکاڵانە (ئحتوا) بکرێن [١٤].

ئەمەش رای کەسێکە دەمارگیر نییە: پێویستە بیرلە گۆڕینی نیزامەکان نەکرێت ئەگەر چیش نیزامی ستەمکاری بن.جگە لەسەپاندنی وشیارانەی چەمکەکان سەپاندنێکی تری هەست پێ نەکراو هەیە ئەویش کاری دەوروبەر. دکتۆر (یوسف قەرەزاوی) باس لەو دەوروبەرە ئایندارە دەکات کەچۆن بچووکترین کەموکورتی تیایدا دیار دەبێت ودەوربەرێکی دوور لەئاین کەبچووکترین پابەندبوون بەئاینەوە وەك دەمارگیری و (تشدد) تەماشا دەکات [١٥].

لەمەوە تێدەگەین چۆن لەکرواتیادا دەربارەی سەرۆکی بۆسنە (عەلی عیززەت بیگۆڤیچ) نووسرابوو کەتوندڕەوە چونکە بیگۆڤیچ هەندێك جار کۆبوونەوەکانی دەوەستان کاتی نوێژ بەمەبەستی ئەوەی نوێژ بکات [١٦].

## ناوەندی ((رۆشنبیر))

ئازادییە ناوەندو دەوروبەرە ((رۆشنبیرییەکان)) بۆ خۆیان بیرباوەڕ دەسەپێنن. پیادەکردنی ئەگەر لەدەوروبەرێکی عەلمانیدا رەخنە لەئاین بگیرێت بەڵام پێویستت بەئازایەتییە تاکو دیفاع لەئاین بکەیت. چەندیش ئاین نامۆ بێت لەناو ئەو دەوروبەرەدا ئەوەندە ئازایەتی پێویستە. بە گشتیش دەوروبەری رۆشنبیری ئیرهابێکی فیکری نەبینراو دەسەپێنێت دژ بەو فیکرەو بۆچوونانەی لەناو ئەو دەوروبەرەدا نامۆن.

جێگەی مەبەست لێرەدا باسکردنی جیهادە. بۆ ئەوەی رێزت بمێنێت دەبێت باس لەجیهاد نەکەیت. لەهەندێك ناوەندا باسی هەمو جۆرە خەباتێکی چەکدار کارێکی نامۆیە.

(ریجی دوبرێ)ی چەپڕەو لەنامەیەکیدا کە لە بەندیخانەدا نوسیبووی باسی ئەو فیکرەیە دەکات کەپیاوی قەڵەم چەك هەڵناگرێت ودەڵێت ئەمە وەکو ئەوەیە بوترێت: کوڕەکەی من ڕێگر نییە، کوڕەکەی من لاوێکی بەشەرەفە [١٧].

## مێشك شۆراوەکان

ئەنجامیش پەیدا بوونی نەوەیەکی مێشك شۆراوە . نەوەیەك زاراوە وپێناسەو پێوانەکان وەکو جل وبەرگ ومۆدێلی‌سەیارە لەدەرەوە دەهێنێت.

نەوەیەك بەهاکانی ((بەهێزەکان)) وەردەگرێت. ئیسلامی وئیرهابی بەیەك دەزانێت. ئەو نەوە مێشك شۆراوەیە بەهاکانی لەناو کۆمەڵگەدا بلاودەکاتەوە ودەیانکاتە بەهای زاڵی ناو کۆمەڵگە. وەنەبێت ئەو بەهایانە لەداهێنانی ئەو بن. مێشك شۆراو خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نییە.

## میانڕەویش وەکو ئیرهاب پێناسەی نییە

(ئیسپۆزیتۆ)مان بیست باس لەو بزاڤە ئیسلامییانە دەکات کە دەتوانن بەشداری لەگەڵ نیزامەکاندا بکەن، واقیع شتێکی تر دەڵێت.

(راشد الغنوشی) لە تونس و (عبدالسلام یاسین)لە مەغریب و (ئیخوان)ی میسر دژ بەتوندو تیژین بەڵام راشد لەبەندیخانەی (بورقیبە)وە بەرەو مەنفا رۆشت نەوەکو بخرێتە بەندیخانەکانی (بن علی)، (عبدالسلام یاسین) لەژێرئیقامەی جەبریدا دانراوە، (ئیخوان)یش دەیان جار داوا دەکەن ببنە حزبێکی رەسمی بەڵام حکومەت رازی نابێت. ئەمانە بە ((میانڕەو)) ناوەدەبرێن.لەمەیش خۆشتر ئەوەیە کە تەنانەت ئەو ناوەشیان پێ رەوا نازانرێت وەك چۆن هەندێك کەس لەبلاوکراوەکاندا باس لە (ئیخوان وتیرۆر) دەکەن.

ئیسلام ئاینی میانڕەوییە بەڵام ئەم میانڕەوییە بەهەڵە تەفسیر دەکرێت. میانڕەوی ئەوەیە کەلە قورئاندا دەبینرێت. جیهاد لە پێناوی خودادا شان بەشانی ئاشتی دەوەستێت. نەفرەت کردن لەچەك میانڕەوی نییە بەڵکو شێوەیەکی تری توندڕەوییە. دەبێت نەفرەت لەزوڵم بکرێت نەك لەچەك، هیچ دەوڵەتێکیش نەفرەت لەجبەخانەکانی خۆی ناکات بەڵکو رۆژ بەرۆژ قەبەتری دەکات.

لەمێژووی بزاڤە سۆشیالیستەکاندا حاڵەتێکی هاوشێوەمان هەیە.ترۆتسکی رەخنە لە (کاوتسکی)ی مارکسی ((تەحریفی)) دەکات ودەڵێت کاوتسکی هیچ ولاتێکمان پێ ناڵێت کەتیایدا لەرێگەی دیموکراسییەوە و بێ ئازار سۆشیالیزم بەدی هاتبێت [١٨].

هەشتا ساڵە قسەکەی ترۆتسکی خۆی دەسەلمێنێت ودەیان ساڵی حوکمی حزبە سۆشیال دیموکراتەکانی ئەوروپا هیچ ولاتێکی‌نەکردە ولاتێك سۆشیالیست.هەر لەمێژووی بزاڤی سۆشیالیستدا و لەسەدەی نۆزدەدا کۆمۆنەی پاریس ویستی میانڕەو بێت و خەڵکی دڵنیا دەکرد کەدەست لەموڵکایەتی نادات بەڵام ئەم دڵنیا کردنە وەك ترۆتسکی دەڵێت چەکی لە دەستی دوژمنانی پرۆلیتاریا نەسەند بەڵکو بە پێچەوانەوە وزە خەباتگێڕەکەی لەپرۆلیتاریا سەند [١٩]، ئەنجامەکەش فەشەلی کۆمۆنەکە جگە لەقوربانییەکی زۆر کە بەپێی سەرچاوە سۆشیالیست وکۆمۆنستەکان زیاد لە (٣٠) هەزار کەس بوو [٢٠].

دەسەڵاتداران هەر کاتێك پێیان باش بێت پەنا دەبەنە بەر چەك و لەرێگەی تۆمەتی ئیرهابەوە چەك بە نەیارەکانیان دادەنێن پاشان داوای میانڕەوی لەو نەیارانە دەکەن.

## بنەماکانی گەمەکە

ئەمەش بنەمایەکی سەرەکیی گەمەکەیە: خۆت چەکدار بکەیت وبەرامبەرەکەت بێ چەك بهێڵیتەوە. دەسەڵاتداران بەندیخانە وسێدارەو موخابەرات وراگەیاندنی خۆیان هەیە ونەیارەکان لەمانە بێ بەشن ولەزۆر ولاتدا قسەکردنیشیان قەدەغەیە.

((ئیرهاب)) شکاندنی بنەماکانی گەمەکەیە بۆیە ناوێکی ناشیرینی پێ دەبەخشرێت. ئیرهاب لەشوێن وکاتێکدا گورز دەوەشێنێت کە دەسەڵاتداران لەناکاو دەبات وزاڵبوون (تفوق)ی سەربازییان دەخاتە مەترسی.

لەبەردەم ئیرهابدا دەسەڵات سوود لەژمارەی زۆری چەکدارەکانی وەکو پێویست وەرناگرێت هەر بۆیەش لێی دەترسێت.

## ئیرهابی رژێمەکان

بۆچی کاری توندوتیژیی ئیسلامییەکان لەبەر چاوترە؟ ئەگەر پرسیارەکەش فراوانتر بکەین دەڵێین: بۆچی کاری توندوتیژیی ئیسلامییەکان وچەپڕەوەکان وراسترەوەکانی جیهان لەبەرچاوترە؟

کۆمۆنیزم نووسین وبۆچوونی توندوتیژی هەیە بەلام کۆمۆنیزم وەك بیروباوەڕێك دژی سەرمایەداری وچەوساندنەوەی کرێکاران سەری هەڵدابوو وکاتێك کاری توندوتیژی دژی حکومەت دەکات هەر ئەوەندەی سەرمایەداری توندوتیژە. ئەم قسەیەمان زێدەڕۆیی نییە و حسابی ماتماتیکی ئەمە روون دەکاتەوە. سەرمایەداری بەدەیان هەزار کرێکاری چەوساندۆتەوە وتائێستاش وتارادەیەکی بەرچاو دەیانچەوسێنێتەوە. سەرمایەداری گەلانی جیهانیشی رەتاندووەو دەیانرەتێنێتەوە بەلام چونکە ئەو هەموو تاوانانە بەسەر ژمارەیەکی زۆری مرۆڤدا دابەش بوون و هەر مرۆڤێك بەشێکی چەوساندنەوەی بەرکەوتووە زوڵمەکە بەزەقی دیار نییە ئەمەش بەپێچەوانەی ئیرهابی کۆمەڵێکی چەکداری کۆمۆنیست کەلەچەند شوێنێکدا چڕبۆتەوە.

ئەمەش وەکو دوو دڵۆپە مەرەکەب یەکێکیان بکرێتە پەرداخێك ئاو وئەوی دیکەیان بکرێتە ناو بەرمیلێك ئاو.

جگە لەکۆمۆنیستەکان رێکخراوە راسترەوەکانی ئەمریکا چەند توندوتیژی پیادە بکەن هەر بەتوندوتیژیی حکومەتی ئەمریکی ناگەنەوە. ئیسلامییەکانیش بەهەمان شێوە. توندو تیژیی حکومەتان لەکارە تیرۆریستیەکان گەورەترە مەسەلەکەش پەرش وبلاوبوونەوەی ئەویان وچڕبوونی ئەمیانە.

ئەمە هۆیەکی زەق نەبوون و دەرنەکەوتنی ئیرهابی دەوڵەتە، هۆکەی تریش ئەوەیە دەوڵەتان لایەنی بەهێزن بۆیە چەمك وپێناسە وتیۆروپاساو بۆیان دەهێنرێنەوەو ئیرهاب ئەوان ناگرێتەوە. گەمەکە هەمیشە گەمەی بەهێزە، ((ئیرهاب)) یش وەك وتمان شکاندنی گەمەکەیە.

## رژێم تیرۆر ناکات

بۆچی (ئیرهابییەکان) تیرۆر پیادە ناکەن؟ یان بابڵێین: بۆچی رژێم کەمتر پەنا بەر تیرۆر دەبات؟ رژێم سێدارەی هەیە بۆیە پێویستی پێی نییە، رژێم زیندانی هەیە. تیرۆری رژێم بریتییە لەزیندانی کردن ولەسێدارەدان وتۆقاندنی خەڵك، لەمەوە دەزانین پەیوەست کردنی وشەی ((تیرۆر)) بەکوشتنەوە هەڵەیەو بەئەنقەست کراوە. باتێبینی ئەوەش بکەین کەچەند رژێمەکە بەهێز بێت ئەوەندە پەنا ناباتە بەر کوشتنی نەیارەکان. رژێم زیاتر نەیارەکانی لەدەرەوەی ولات دەکوژێت چونکە دەستی پێیان ناگات وناتوانێت بیانخاتە زیندان ولەسێدارەیان بدات.

## ((ئاسایش)) و سوپای گەل

کێشەی یەکەمی ((ئیرهابییەکان)) لەگەڵ هێزەکانی ((ئاسایش)) دایە. کێشەی هەموو خەڵکەکە لەگەڵ ئەو ئاسایشەیە. رژێمەکانی زیاتر پشت بەموخابەرات ودەزگاکانی ئەمن دەبەستن وکەمتر پشت دەبەستن بەسوپا.

لەراپەڕینی ١٩٩١ی عیراق وکوردستاندا بینیمان چۆن پیاوانی ئەمنی بەعسی بەو پەڕی توندوتیژییەوە کوژران لەکاتێکدا سەربازە عەرەبەکان لەکوردستاندا هەر بەجل وبەرگی سەربازیی خۆیانەوەو بەو پەڕی ئازادییەوە لەناو شارەکاندا دەگەڕان وتەنانەت خواردن وپارەشیان لەلایەن خەڵکەکەوە پێ دەدرا. لەراپەڕینی١٩٨٩ش دژی دیکتاتۆرە کۆمۆنیستەکەی رۆمانیا (چاوشیسکۆ) نەك تەنها سوپاو ئاسایش (پۆلیسی نهێنی) لەیەکتر جیابوونەوە بەڵکو تەنانەت سوپا خۆی چەکی ئاراستەی ئاسایش کرد. ئەمە حاڵی هەموو ولاتێکە. ئاسایش دەزگایەکی تۆقاندنە لەکاتێکدا سوپا سوپای گەلە.

ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ بواری کارو مەبەستی دامەزراندنی هەر یەکێکیانە.

بواری کاری ئاسایش ((بەرەی ناوەوەیە)) و لەبەر ئەوە زەبرو زەنگەکەیئاراستەی هاوولاتیان دەکات لەکاتێکدا زەبری سوپا ئاراستەی دوژمنی پشت سنوورە. سوپا تەقالیدی سەربازیی خۆی هەیە لەکاتێکدا ئاسایش خاوەن ((ئەخلاقیاتی)) تایبەتی خۆیەتی. سوپا بۆیە سوپای گەلە چونکە هاوولاتیان تیایدا بەشدارن لەکاتێکدا ئاسایش هەڵبژاردەیە. سوپا هەموو جۆرە کەسێکی تێدایە وئاسایش مواسەفاتی تایبەتی لەئەندامەکانی دەوێت. سوپا لەرۆژدا کاردەکات تاریکیش بۆ ئاسایش گونجاوترە.

ئەم جیاوازییانە لەهەموو شوێنێکدا هەن. بێگومان هەندێك ولات بۆ سەرکوت کردنی نەیاران پشت بەسوپا دەبەستن بەلام ژمارەی ئەو ولاتانە کەمن ویاسا گشتییە بۆ باقی حاڵەتەکان راستە.چەندیش زەبرو زەنگی ئاسایش وموخابەرات زۆرتر بێت ئەوەندەش پاساوەکانی ((ئیرهابییەکان)) گەورەتر دەبن.

## ڕاگەیاندن لەخزمەتی بەهێزدایە

ڕاگەیاندنی لایەنە بەهێزەکان دەیەوێت هاوکێشەکە ڕاست بکاتەوەو پاساو بۆ ((ئیرهاب)) نەهێڵێت.کاری یەکەمی ڕاگەیاندن دورخستنەوەی خەڵکەکە لە ((ئیرهابییەکان)) و لەو مەسەلەیەی ((ئیرهابییەکان)) هەڵیانگرتووە.

نموونەیەکی نزیك لەخۆمانەوە بڵێین: برادەرێك لەراگەیاندنی حزبێکی عەلمانیدا کاری دەکرد بۆی باس کردم چۆن کاتێك هەواڵێکی لەکەناڵێکی جیهانییەوە وەردەگرت فەرمانی پێ دەدرا دەستکاریی بکات.جارێکیان هەواڵی گرتنی چەند ئەندامێکی (ئیخوان) یوەرگرت و کەمامۆستا و ئەندامی پەرلەمانیان تێدا بوو. ئەو هەواڵە دوایی لەو دەزگا کوردییەوە وەکو گرتنی چەند تیرۆرستی ئیسلامی بڵاوکرایەوە.

نموونەیەکی نزیکتر: لەرۆژنامەی حزبێکی دەسەڵاتداری کوردیدا هەواڵێك بڵاوکرایەوە، ئێمەش لە (ڕێگای‌یەکبوون)دا هەواڵەکەمان وەکو خۆی دابەزاند. تەماشا بکەن چۆن ڕاگەیاندن دەوری خۆی دەبینێت: ئەمەیان هەواڵەکەی خۆمانە:

**سەرەڕای پابەندبوونی (الجماعة الاسلامية) بەوەستاندنی توندوتیژی پۆلیسی میسر چوار ئەندامی (جماعة) دەکوژێت.**

هەرچەندە (الجماعة الاسلامية)ی میسر لەمانگی ئازارەوە ڕایگەیاندبوو کە کاری توندوتیژی دەوەستێنێت بەڵام پۆلیسی میسر سەرکردەیەکی (جماعة) و سێ ئەندامیان لەباشووری قاهیرەدا کوشت، لەوەڵامی ئەمەشدا پارێزەر (منتصر الزيات) بڕیاری دا دەست لەکاربکێشێتەوە وداوای لەسعودیە کرد کە لە (مەککەدا) دانشێت. (منتصر الزيات) دەرکەوتووترین کەسە لەناو ئەو پارێزەرانەی کە لە دادگادا بەرگری لەئیسلامیەکان دەکات. (الزيات) ڕایگەیاند کە سێ کوژراوەکە پابەندی ئاگر بەست بوون وکوشتنیان کاری خراپی هەیە لەسەر وەستانی کاری توندوتیژی، هەروەها حکومەتی میسری بەوە تاوانبار کرد کە بەشێوەیەکی ئیجابیانە مامەڵە لەگەڵ دەستپێش خەرییەکەی (جماعة) ناکات (*ڕێگای یەکبوون ژمارە ٤٦، ١٩٩٩/٩/٢٢ لاپەڕە٢*) ئەمەش هەواڵەکە لەرۆژنامەی حزبە دەسەڵاتدارەکە (لە١٩٩٩/٩/٨ ل١).

**میسر کوژرانی (٤) توندرەو**

تەلەفزیۆنی ئەلجەزیرە: پۆلیسی میسر لەیەکێك لەشەقامەکانی قاهیرەدا (٤) کەسی سەر بەگروپە ئیسلامیە چەکدارەکان کوشت لەم بارەیەوە پۆلیسی میسر ڕایگەیاند، ڕووداوەکە لە (جيزة) ڕوویدا کاتێك ژمارەیەك پۆلیس بەدوای یەکێك لەسەرکردەکانی گروپی ئیسلامیەکانەوە بوون بەمەبەستی دەستگیرکردنی.

*(هەواڵەکەش سێبەرێکی بۆری بۆکرابوو تا بەزەقی دەربکەوێت)*

ئەمە لای خۆمان. لەرۆژئاواشدا هەمان بەزم هەیە" لەراستیشدا ئەمەی لای خۆمان تەنها دەنگدانەوەی ئەوەی رۆژئاوایە.راگەیاندن پاڵەوان وئیرهابی وبێ تاوان... دروست دەکات. (ریجی دوبرێ) لەبەندیخانەدا بوو کاتێك پیاوێکی کوبی کە بەکرێگیراوی موخابەراتی ئەمەریکی بوو سەودایەکی لەگەڵدا کرد: ئەگەر (دوبرێ) هاوکارییان بکات هەڵمەتە ئیعلامییەکە لەدژی زۆر زوو دەوەستێنرێت. وەك چۆنیش دروستیان کرد لەچەند ڕۆژێکدا نایهێڵن وهەموو وتارو هەڵمەتەکانی ڕۆژنامەکان وپۆستەرەکان لەشەقامەکاندا وخۆ پیشاندانەکان کۆتاییان پێ دێت. ئالەو کاتەدا (دوبرێ) گوێی لەهاواری دەیان خۆپیشاندەر لەدەرەوەی بەندیخانەدا بوو داوایان دەکرد لەسێدارە بدرێت [٢١].

باسی ئەمرۆش بکەین" بیریاری فەڵەستینی (ئێدوارد سەعید) باس لەسیمینارێکی تەلەفزیۆنی دەکات ئەویش نێوان (ئێریك رولۆ)ی رۆژنامەنووسی ناوداری فەرەنسی لەگەڵ جیمس وۆلزی (سەرۆکی پێشووی CIA) وجیمس کیمپ کەناوی ((پسپۆڕ لەئیرهاب))ی لێنراوە.

(رولۆ) سێ جار هەوڵی دا چۆنێتی دامەزراندنی بزووتنەوەی (حەماس) باس بکات بەڵام پێشکەشکاری بەرنامەکە ڕێگەی قسەکردنی بێ نەدا. ئیدوارد سەعید دەڵێت: گرنگ سەلماندنی ئەوەیە کەئەوان ((دژ بەئیرهابی ئیسلامییەکانن)) ودڵیان بەمە خۆشە، غەیری ئەوەش گرنگ نییە [٢٢] واتە گرنگ دروستکردنی ((شەیتان)) کەیە.

جگە لەدوژمنایەتی کردنی ئیسلام وئیسلامییەکان و ڕۆژهەڵات بەگشتی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا شتێکی تر پاڵی پێوە دەنێت ئەویش ورووژاندن (اثارة). ڕاگەیاندن تا ورووژاندنی زیاتر بێت قازانجی ماددیی زیاترە، ڕاگەیاندنیش لەرۆژئاوادا بازرگانییە. ڕۆژنامەو گۆڤارو کەناڵە جددییەکان سەرفیاتی کەمتریان لەکەناڵەکانی ورووژاندن هەیە بۆیە قازانجیشیان کەمترە. نموونەش ئەمە ڕوون دەکاتەوە: بابڵێین تەقینەوەیەك ڕووی دا" ئایا کامیان سەرنجی خەڵك ڕادەکێشێت" بوترێت تەقینەوەکە بەهۆی گازو بەنزین

بوو یان بوترێت چالاکییەکی تیرۆریست بووە؟ وەڵامەکە ئاشکرایە. ڕاگەیاندنیش تەماشا دەکات چی زیاتر وورووژاندنی تێدایە تەرکیزی دەکاتە سەر، وورووژێنترین شتیش ئەمڕۆ ئیسلامییەکان و ((مەترسی ئیسلامییە)).

پاش تەقینەوەکەی شاری (ئۆکلاهۆما) لەئەمریکادا (کەدوایی دەرکەوت ڕاستڕەوە ئەمریکییەکان بەئەنجامیان داوە نەك ئیسلامییەکان) ناودارترین ڕۆژنامەی (تابلۆید) لەبەریتانیا (کەسێ ملیۆن دانەی لێ دەردەچێت لەکاتێکدا ڕۆژنامە جیددییەکان وەکو گاردیان یان ئیندیپێندێنت، پێنج سەد هەزار تاملیۆن دانەیان لێ دەردەچێ) هەواڵەکەی بڵاوکردەوەو تیایدا وێنەی پیاوێکی هێزی ئاگرکوژێن دانرا کە منداڵێکی هەڵگرتووەو مانشێتە سەرەکییەکە ئەمە بوو: بەناوی ئیسلام یاخود لەپێناوی ئیسلامدا (هەر چەندە ڕۆژنامەکە ڕۆژی دوایی ئەمەی گۆڕی) [٢٣].

## هونەرو ئەدەب لەکارواندا




دەسکەوتنی قازانج لەڕێگەی وورووژاندنەوە لەهونەرو ئەدەبدا درێژەی پێ دەدرێت.نووسەرێك باس لەڕۆمانی میللی ئینگلیزی وئەمریکی لەپەنجاکان وشەستەکانی سەدەی بیستدا دەکات کە پاڵەوانەکانی کاری وێرانکاری وەك زانای شێت یان جەنەڕاڵی گرژ یان تاوانباری نازی پیشان دەدران بەڵام لەم ماوەی دواییەدا تاوانباری نوێ هاتنە مەیدان ئەوانیش ئوسوڵییە ئیسلامییەکان کەپاڵەوانەکانی نووسینگەی توێژینەوەی فیدراڵی (FBI)ی ئەمریکی هەوڵ دەدەن جیهان لەپیلانە شەیتانییە کانیان ڕزگار بکەن[٢٤].

بۆ نموونە ڕۆمانی تیمی سەوز (ساڵی ١٩٩٥ بڵاوکراوەتەوە) کە باس لەنزیك بوونەوەی جەنگێکی پیرۆزو سەرکردەیەکی پێچ و پەناکەر و بە (سەڵاحەددین)ێکی نوێ دەزانرێت دەکات . سەرکردەکە دەست بەسەر بزووتنەوەیەکی ئاینی توندو تیژ دەگرێت، ئەم پێشەوایە زۆر حەزی لە دەسەڵاتە و زۆر عەبقەرییە، بزووتنەوەکەش دورەی جیهان دەدات و خێرا بەهێزتر دەبێت و لێدانە کوشندەکەی ئاراستی ڕۆژئاوا دەکات[٢٥].ئەمە نموونەیەکە لە دەیان، ناوی ڕۆمانەکانیش باشترین وەسفە بۆیان: زەویی بێ باوەڕان (١٩٨٩ بڵاوکراوەتەوە)، جەنگی پیرۆز (١٩٨٩)، مەهدی (١٩٨١)، درزێك لە ماڵی خودادا (١٩٨٣)، حاجی (١٩٨٤)، پەردەی دڕاو (١٩٨٤)، سەربازەکانی خودا (١٩٩٢)[٢٦]. سینەما لەنووسراو کاریگەرترە چونکە جەماوەریترە و وورووژێنەرترە. ئەوسا (کاوبۆی)ی ئەمەریکی دژ بە هیندییە سوورەکان دەجەنگی وەك چۆن ئەمریکییەکان خاوەنی ئەسڵی وڵات بن و هندییەکان داگیرکەربن. ئەم جارە ئیسلامییەکان دوژمنی مرۆڤایەتین وئەمریکییەکان ڕزگارکەرەوەیئەو مرۆڤایەتییەن.

لەیەکێك لەو فلمانەدا موسڵمانانی ئەمریکا لەکاتی نوێژدا پیشاندراون و لەکاتی سوجدەدا دەهۆڵی جەنگ لێدەدرێن. دیمەنێکە کەخوێنەری ئەم باسەمان دەتوانێت بەهۆیەوە وێنەیەك بۆ خۆی سەبارەت بەفلمانە دروست بکات . چەندیش وێنەکەی تەواو بێت ئەوەندە دەزانیت فلیمی وا چەند کاریگەری لەسەر عەقڵی ڕۆژئاواییدا هەیە.

## کوشتنی ڕۆشنبیران

ئەو هونەرو نووسینەی کەئاوا جەنگ دژی ((ئیرهاب)) دەوروژێنێت نووسەران و هونەرمەندان وەکو شەهیدی دەستی ئەو ئیرهابیانە نیشان دەدات. باواز لەڕۆژئاوا بهێنین و بێینەوە ڕۆژهەڵات.

زیندانەکان ئامادەن بۆ ڕۆشنبیرانی نەیاری ڕژێم، ئەو کەسەش کەدووره وڵاتەو قەڵەمەکەی جێگەی مەترسییە کوشتن ئاکامێتی. ((ئیرهابییەکان)) هەمان کار پیادە دەکەن بەڵام لەگەڵ یەك جیاوازیدا. ئەو نووسەرو هونەرمەندەی بەر زەبری ئەوان دەکەوێت زۆربەی کات کەسێکی سەر بەڕژێمە وخزمەتکاری ڕژێمە، ئیتر ئایا لەڕووی فیکرییەوە پاساو بۆ ڕژێم دەدۆزێتەوە یان پاساو بۆ سیاسەتی ڕژێم دەهێنێتەوە. هاوکێشەکەش بەم جۆرەی لێ دێت:

ڕژێم هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی لەبەردەستدایە لەکاتێکدا نەیارەکان ناتوانن قسە بۆ کەس بکەن. لەو لاشەوە نووسەران وهونەرمەندانی بەکرێگیراو وێنەی ناشیرینی ڕژێم جوان دەکەن.لەهەندێك ولآتدا نەیاران دەتوانن قسە بکەن وتەنانەت کەناڵی ڕاگەیاندنیان هەبێت بەڵام:

١- ڕۆژنامەیەکی نەیاران چی بۆ دەکرێت بەرامبەر ژمارەی زۆری بڵاوکراوەکانی ڕژێم؟ ڕژێم سامانی وڵاتی لەبەر دەستدایە بۆیە دەتوانێت بڵاوکراوەی زۆری هەبێت ودرۆی زۆرتر بخاتە بازاڕ.

٢- نەیاران ڕۆژنامەیان هەیە بەڵام ناتوانن تەلەفزیۆن ورادیۆیان هەبێت. کەواتە ڕژێم براوەیە چونکە رادیۆ و تەلەفزیۆن جەماوەریترن.

٣ – لەکەم وڵاتدا نەیاران تەلەفزیۆن ورادیۆیان هەیە ولەو وڵاتانەش دیسان هەر وەکو ڕۆژنامە دەنگی ڕژێم بەرزترە.

٤ – بەپاڵ هەموو ئەمانەشەوە نەیاران لەئاکامی بەکار هێنانی ئەو ئازادییە نسبییە دەترسن.

مەسەلەکە بەر لەوەی کوشتنی ((ئازادیی فیکر)) و ((تیرۆری قەڵەم)) وقسەی لەم جۆرانە بێت کێشەی نەبوونی هەمان بوارو ئیمکانیاتە بۆ ڕژێم ونەیارانی، لەم ناعەدالەتەشەوە کوشتنی هونەرمەند ونووسەری سەر بەرژێم سەرهەڵدەدات. ئیدانەکانی کوشتنی نووسەرێکی بەعسی بۆ نموونە کەقەڵەمەکەی خستۆتە خزمەتی ستەمکاریەکەی ڕژێم ئیدانەیەکن شایەنی گاڵتە پێکردنن.

وەك وتمان دەسەڵاتداران ئەوانە دەکوژن کەدەستیان نایانگاتێ وناتوانێت زیندانیان بکات، ژمارەی ئەوانەش کەم نییە.عەلمانییەکان دەستێکی باڵایان هەیە لە کوشتنی نووسەران و ڕۆشنبیران بەڵام لەبەر ئەوەی ئامێری پروپاگندە لەژێر دەستی ئەواندایە تەنیا ئیسلامییەکان بەم کارە تاوانبارن. لەکوردستاندا کوشتنی هونەرمەند (ماجد حەمەجوان) و (بەکر عەلی)ی شاعیر و مامۆستای زانکۆ (دکتۆر موحەممەد عەزین) وهەڕەشەکردن لەژمارەیەك نووسەر لەبەر ئەوەی ڕاگەیاندنی حزبێکی تریان بەهێز کردووە بەئیرهابی عەلمانی ناژمێردرێن. سەیریش نییە کەبکەری ئەوانەن کە هەمیشە باس لەتیرۆری ئیسلامییەکان دەکەن.

## کوشتنی ئافرەتان

کوشتنی ئافرەتان لەبەر مەسەلەی (شەرەف) ناچێتە خانەی تیرۆری سیاسی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا با بەخێرایی باسی کوشتنی (غسل العار) بکەین.

ئیسلام سزای بۆ هەردوو پیاو وئافرەت داناوە لەحاڵەتی زینادا بەڵام ئەو سزایە فەرمانڕەوا دەیسەپێنێت ومەرجی قورسی خۆی هەیە کەیەکێکیان هەبوونی چوار شایەتە کە زیناکەیان بینووە، واتە کوشتنی ئافرەتێك لەلایەن باوکی یان برایەوە بەهیچ شێوەیەك ئیسلام پەسەندی ناکات. خۆئەگەر حوکمە ئیسلامییەکە بەسەر زینادا بچەسپێنرێت پێویستە چەند ئافرەت سزا بدرێن ئەوەندە پیاو سزا بدرێن چونکە زینا بەزۆری لەناو پیاواندا بڵاوە. بێگومان بەشێك لەو پیاوانە ئەو کەسە حزبیانەن کە هانی نەزانەکان دەدەن بۆ ئەوەی کوشتنی ئافرەت بخەنە پاڵ ئیسلامییەکان.بەم شێوەیە (غسل العار) لەیاسایەکی عەشایەری بەدەر نییە. دەمێنێتەوە کوشتنی ئافرەت بەهۆی سیاسیەوە کە عەلمانییەکان دەستێکی باڵایان لەمەدا هەیە.

بابۆ مێژوو چیرۆکی (خەبات عزت) بگێڕینەوە. (خەبات) لەناو فەرمانگەکەی خۆیەوە بەقژ دەرهێنرایە دەرەوە. پاش ماوەیەکیش کوژرا، ڕێگەیش لەفەرمانگەکە گیرا لافیتەی ماتەمینی بۆ هەڵواسرێت، دوای کوشتنیشی قسە بڵاوکرایەوە کە لەبەر ((بێ ئەخلاقی)) کوژرا.کەس لەو ناوچەیەدا لەسەر (خەبات) نەڕۆشت.

نوکتەیەکی تر ئەوەیە لەیادەکانی هەشتی مارسداو پاش ڕووداوەکە دوو ڕۆژ سیمینار بۆ کێشەی ئافرەت بەسترا. لەناو هەشت تەوەرەدا یەك تاکە تەوەرە دانەنرا بۆ ئەو کێشەیەی هەمیشە لەسەر زماندا بوو واتە (کوشتنی ئافرەتان). یادکردنی هەشتی مارسی ئەو ساڵە لەبەر ڕووداوەکەی خەبات پێویستی بەپشت گوێ خستنی کوشتنی ئافرەتان دەکرد.

کەناڵەکانی تریش ئەم کێشەیەیان پشت گوێ خست. ساڵی دواییش کێشەکە هێنرایەوە باس چونکە کوشتنی (خەبات) دوورکەوتەوە. ڕووداوێکی نزیکتریش لێدانی ئافرەتێکی داپۆشراو لەلایەن مێردەکەیەوە کەبووە هۆی مردنی. پیاوەکە سەر بەحزبێکی دەسەڵاتدار بوو کەچی درۆکرا گوایە پیاوەکە سەر بەحزبێکی ئیسلامییە، تاوانێکی تریش کەخرایە ژێر خۆڵەوە تاوانی دەسەڵاتدارێکی گەورە بوو ئەویش دەست درێژی ناموس لەسەر خزمەتکارێکی نەصرانی و پاشان کوشتنی و دوایتر شاردنەوەی لاشەکەی. پێویستە هەموو کوشتنە سیاسی و ناسیاسییەکانی ئافرەتان لەلایەن عەلمانییەکانەوە بخرێنە ژێر خۆڵەوە و بەزۆر ئەو

کوشتنانە بەسەر ئیسلامییەکاندا بسەپێنرێن چونکە هونەرو ستراتیجییەتی عەلمانی ئەمە دەخوازێت(لەبارەی ئەمەوە بڕوانە ڕێگای یەکبوون ژمارە ٦٢ ل٦).

## تیرۆر لە کوردستان بەژمارە

دەوڵەت نەیارانی تیرۆر دەکات چونکە مەترسییان لەسەر بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت هەیە، حزبە حاکمەکانیش بەهەمان شێوە. دەسەڵاتداران زۆر کەم بایەخ بەبیروباوەڕ دەدەن، تائێستاش نەمانبیستووە لەم دواییانەدا عەلمانییەکان لەکوردستاندا بەکوشتنی کەسێك تاوانبار کرابن کەزیانی بۆ (کوردایەتی) هەبێت. کوشتنەکان هۆکاری حزبییان بەدواوەیە.بەڵام ئەگەر واز لەهۆکارەکانی کوشتن بهێنین و بێینە سەر ژمارە و ئامار دەبینین کە ئەوەندەی دەسەڵاتداران کوشتنیان بەسەردا سەپاوە ئەوەندە بەسەر ئیسلامییەکاندا نەسەپاوە.

ئێمە دەیان نموونەی جۆراو جۆر دەزانین بەڵام نەوەکو نەیارانی ئیسلامییەکان بەوە تۆمەتبارمان بکەن کەنموونەکان بەئارەزوو هەڵدەبژێرین ئێمە شایەتێکی بێ لایەن نێوان ئیسلامییەکان ودەسەڵاتداران دەهێنینەوە.. شایەتەکەمان کتێبی (هاوڕێنامە)یە کەنووسەرەکەی ئەندامێکی کۆنی (پاسۆك)ە. ئەگەر لەپاش ڕاپەڕینەوە سەرژمێریی کوشتن وهەوڵی کوشتن و تەقاندن بکەین بۆمان دەردەکەوێت دوو حزبی دەسەڵاتدار (٩) کاریان ئەنجام داوە بەرامبەر (٢) کاری ئیسلامی ئەوەیش ئەگەر ئەو هەوڵانە حساب نەکەین کەلەمیانەی جەنگی ناوخۆوە درابوون و کەژمارەکان زیاتر دەکات. لێرەدا خاتری دوو حزبی دەسەڵاتدارمان گرتووە چونکە ئەگەر لەپێش ڕاپەڕینەوە دەستمان پێ بکردایە دەفتەری حسابیان قورستر دەبوو.لەلایەکی تریشەوە ژمارەی ئەو کارانەی‌کەکتێبەکە نەیخستبوونە پاڵ هیچ لایەنێك نزیکی (٢٠) ڕووداوە و کە ئەوەندەی دەزانین بەشی هەرە زۆری ئەگەر هەموویان نەبن لەسەر دەستی عەلمانییەکان کراون[٢٧]. لێرەشدا دیسان خاترانەمان لەیاد نەکردووە.هەر لەو ڕووداوانە کوشتنی پێنج کارمەندی (UN) ورێکخراوی بێگانەوکە کەس تۆمەتەکەی نەخستۆتە سەر ئیسلامییەکان.

بۆچی حزبی دەسەڵاتدار پەنا بەر تیرۆر دەبات؟ ئەی نەمان وتبوو ڕژێم تیرۆر ناکات؟ هاوسەنگییەکەی نێوان دوو حزبەکە لەلایەك وفشارەکانی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان لەلایەکی ترەوە ڕێگە بەهیچیان نادەن پەنا بەرێتە بەر وەسیلە تەقلیدییەکانی حکومەتەکان وەکو: گرتنی بەکۆمەڵ، لەسێدارەدان...

لەو باسەی سەرەوەشماندا دوو ئەنجاممان دێتە دەست:

١- عەلمانییەکان زیاتر پەنا بەر تیرۆر دەبەن وئەگەر بۆیان نەکرێت کەس بگرن و زیندانی بکەن ژمارەی تیرۆرکراوان زۆر زیاتر دەبێت.

٢- بەهۆی فشارەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەستی دەسەڵاتداران دەبەسترێتەوەو دەسەڵاتداران پەنا دەبەنە بەر تیرۆر.

## حزبە کوردییەکان و ناڕەواییەك

ڕاگەیاندنی هەندێك لە حزبە کوردییەکان ناڕەواییەکی گەورە دژی موسڵمانان وئیسلامییەکان دەکەن: سەربەخۆیی خوازانی فلیپین وچیچان وکەشمیر بەتوندڕەو وتیرۆریست ناو دەبەن و ناوی (سەربەخۆیی خوازان) بەگاورەکانی ئەندەنووسیاو باشووری سودان دەدەن.

ئیسلامییەك لەگەڵ خودی خۆیدا ناڕێك نابێت ئەگەر ئەوانەی ئەندەنووسیا و سودان بەیاخی بوو بزانێت چونکە پێوانەی کەسێکی ئیسلامی پابەندبوونە بە ئیسلام بەڵام پێوانەی حزبە کوردییەکان مافی سەربەخۆ بوونە بۆیە دەبوایە بۆ ئەوانەی چیچان وکەشمیر وفلیپین وشەی سەربەخۆیی خوازیان بەکار بهێنایە بەڵام کەوشەی توندڕەو بەکار دەهێنن تووشی ناڕێکی دەبن، ئەم کاتەش بۆ ڕزگار بوون لەو ناڕێکییە پێویستە بڵێن پێوانەی ئێمە ((دوژمنایەتی ئیسلام وئیسلامییەکانە)).

سەیریش لەوەدایە کەئەوانەی چیچانییەکان بەتوندڕەو ناودەبەن لەهەرزاردا یەکی چیچانییەکان شەڕیان بۆ ناکرێت و وەکو ئەوان ئەوەندە سوور نین لەسەر سەربەخۆیی بەڵکو تەنانەت ناوی سەربەخۆییشیان لەیاد چووە. ئەمەش بەمەرجێك کەچیچانی خاوەن ملیۆن ونیو هاووڵاتی نەفەری دژی ڕووسیای (١٥٠) ملیۆنی شەڕ دەکات لەکاتێکدا چوار یان پێنج ملیۆن کورد گیرۆدەی حکومەتی عیراقن کەبیست ملیۆن مرۆڤی لەژێر دەستدا نییە.

ڕووسیا خاوەن جۆرەها چەکی پێشکەوتوو و عیراق وێرانە. کورد کۆمەکی دوو دەوڵەتی جیهانیی هەیە وچیچانییەکان نەك تەنها ڕووسیا بەڵکو هەموو ڕۆژئاوا دژ بەسەربەخۆ بوونیانە.

چیچانییەکان گەیشتنە لوتکەی خەبات ولێهاتوویی جەنگی لە کاتێکدا ئەوانەی بەتوندڕەو ناویان دەبەن یان بەتانکی ئەم و ئەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنن یان کەدەبیستن تانکی دوژمن هاتووە هەڵدێن. پاش ئەمەش شەرم نییە چیچانییەکان بەتوندڕەو ناوبرێن؟ بریا ئەوەندەی چیچانییەکان توندڕەو بوونایە.

نەیارانی ئیسلامییەکان تەقاندنەوەیەکی (حەماس) و (جیهاد) بەتیرۆر دەزانن لەکاتێکدا دەزانن جوولەکە زەویی فەڵەستینییەکانیان داگیرکردووە و کەئەمە هاوشێوەی تەعریبەکەی حزبی بەعسە.ئەگەر (جیهاد) و (حەماس)یش تەقینەوەیان ئەنجام دابێت ئەوا کورد بەچەکدارەوە هەڵیکوتاوەتە سەر گوندە عەرەب نشینەکانی کوردستان. بۆ نموونە ساڵی ١٩٨٥ چەکدارانی حزبێکی کوردی هێرشیان کردبووە سەر چەند گوندێکی عەرەب نشین لەناوچەی هەولێرداو وەك (هاوڕێنامە) دەڵێت: ژمارەیەکی زۆر لەپیاو وژن ومنداڵی عەرەب کوژران. ساڵی (١٩٨٨)یش هێریشێکیان کردە سەر گوندێکی وەها لەهەمان ناوچەداو ((دەیان ژن ومنداڵ و پیاوی گوندەکەیان کوشت)) [٢٩].ئایا ئەم کارە ڕەوابوو؟ ئەگەر ڕەوابوو ئەی بۆچی ئەوانەی (حەماس) و (جیهاد) ڕەوانین؟ ئەگەر ڕەوا نەبوو بۆچی ناڵێن کاتی خۆی کاری ئیرهابیمان کردووە؟عەلمانیەتی کورد لەناو قەیرانێکی بەهاو بیرکردنەوەو دادپەروەریدا دەگەوزێ وهەست بەخۆی ناکات... هەمووش دەگەڕێتەوە بۆ دوژمنایەتی کردنی ئیسلامییەکان.

## ڕەوتی بنە بڕکردن

لەناو زۆربەی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا ڕەوتێك هەیە داوای بنەبڕکردنی ئیسلامییەکان دەکات. بەشێکی ئەو ڕەوتەش داوا دەکات ئەم بنەبڕکردنە هەموو جۆرە ئیسلامییەك بگرێتەوە هەتا ئەگەر سەلماندبێتی توندوتیژی بەکار ناهێنێت. بەشێکی ئەو بەشەش دەیەوێت هەرچی شوێنەوارێکی ئیسلامە لەناوی بەرێت.

یەکێك لەبەر جەستە بوونەکانی ئەو ڕەوتە لەجەزائیردا هەیە. ئەو ڕەوتە بەرپرسە لەبەشێکی زۆری ئەو تاوانانەی دژی هاووڵاتیان دەکرێت ولێرەدا جێگەی خۆیەتی نەختێك لەسەر ئەو وڵاتە بدوێین. دیپلۆماسییەکی کۆنی جەزائیری (لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕادیۆی لەندەندا ڕۆژی١٠/١٠/١٩٩٧) دەیوت کەوا تاقمە چەکدارەکان سیانن: سوپا، ئیسلامییەکان، میلشیاکانی سەربەحکومەت، بەرپرسەکە دەڵێت ئەمانەی دواییان لەهەموویان پڕمەترسیترن.

زۆربەی هەرە زۆری زانیارییەکانی جەزائیریش لەرێگەی ڕاگەیاندنی ڕەسمیی وڵاتەوە دەچنە جیهانی دەرەوە. ڕاپۆرتی ڕێکخراوی عەفوی نێودەوڵەتی لە تشرینی دووەمی١٩٩٦ دەڵێت کە کوێت و بەندەکان لەسەر هۆکانی ڕاگەیاندن کە لە دەرەوەی جەزائیروە هاتوون زیادیان کردووە، هەندێك ڕۆژنامەنووسی بیانی لەجەزائیر دوور خرانەوە و هەندێکیشیان ڕێگەیان پێ نەدرا بێنە ناو وڵات وئەوانەی ڕێگەیان پێ دراوە بەردەوام لەژێر حەراسەتی ئاسایشدان بۆیە وەك ڕێکخراوەکە دەڵێت هەواڵی زۆرکەم ڕەوانەی جیهانی دەرەوە دەکرێت [٣٠].

لەبەر ئەوە گومانی زۆر لەم بارەیەوە سەریان هەڵداوە. (جۆن سوینی) هەواڵنێری ڕۆژنامەی (ئۆبزێرڤەر)ی بەریتانی باسی گومانی جیهان لەبارەی زیاد بوونی کاری کوشتار دەکات و دەڵێت هەواڵنێران (ڕۆبەرت فیسك) لەرۆژنامەی (ئیندیپێندێنت) وئەنتۆنی لۆید لەگۆڤاری (تایمز) وسایرا شاه لە کەناڵیچواری سەربەخۆی تەلەفزیۆنی بەریتانی چوونە جەزائیر وبەڵگەی خۆیان دەست کەوت لەسەر بەشداری حکومەتی جەزائیری لەکوشتارەکاندا وهەواڵەکانی ئۆبزێرڤەریان دووپات کردەوە. بەوتەی (سوینی) تەنها ڕۆژنامە نووسە جەزائیرییەکان ڕێگەیان پێ دەدرێت نزیك بکەونەوە لەشوێنی قەسابخانەکان ئەمانەیش پەیوەندی پتەویان هەیە لەگەڵ پۆلیسی نهێنی جەزائیریدا [٣١].

ئەو شتانەی گومان دروست دەکەن ئەوەیە کەزۆر لەکوشتارەکان نزیك سەربازگەکان بەرپا دەکران، هەروەها لەو ناوچانە دەکران کەدەنگیان بۆ ئیسلامییەکان دابوو وەك بڵێی مەبەست تۆڵەسەندن بوو لێیان.

جێ پەنجەی دەرەوە لەرووداوەکانی جەزائیر دوور نییە، بۆ نموونە کۆتایی ١٩٩٦ جەزائیرییەکان بەگشتی ئەو باوەڕەیان هەبوو کە بێگانە سوودمەندی یەکەم ودوایەمینە لەرووداوەکان، بەتایبەتیش فەرەنسا وهەندێك وڵاتی ئەورووپی ئەوەش لەمیانەی ململانەکەیان دژی ئەمریکا بۆ دەست گرتن بەسەر جەزائیردا. هەر بۆیە نووسەری ئەم وتانە دەپرسێت: ئایا توندوتیژی لەجەزائیر ئیسلامییانە دەستی پێ کرد و ئێستا بۆتە توندوتیژیی عەلمانی؟ ئەمەش لەروانگەی بەیاننامە سەیرەکەی پەرلەمانی ئەورووپی کەچەپڕەوەکان بەسەریدا زاڵە (ئەمەش ساڵی ١٩٩٦ بوو) کەداوای کردبوو جەزائیر واز لەزمانی عەرەبی بهێنێت ودەوڵەتی عەلمانی دروست بکات [٣٢] . دەمێنێتەوە ئەو ڕاستیەی کەزۆربەی ئەو قەسابخانانەی دەدرێنە پاڵ ئیسلامییەکان (الجماعە الاسلامیە

المسلحە GIA) پێیان تاوانبارە و دەنگ و باسی زۆر هەن کە دەزگا ئەمنییەکانی جەزائیر دەستیان وەرداوەتە ناو لاشەی (الجماعە)و هەندێك لایەنی ناو جەزائیر بەرژەوەندییان لەکارەکانی ئەو کۆمەڵەدا دەبیننەوە.

بێگومان زەمەنێکی دەوێت تاهەموو راستییەکان روون ببنەوە. ئەو هەواڵانەش کە ئەمڕۆ لە جیهاندا و بەتایبەتی لەکوردستاندا بڵاودەکرێنەوە جێگەی هیچ متمانەیەك نین و تاکە مەبەستیان لەکەدار کردنی گشت ئیسلامییەکانە.

ئەمە وەك بەرجەستەبوونێکی رەوتی بنەبڕکردن، ئەم رەوتە لەهەموو ولاتێکدا هەیە. لەهەندێك ولاتدا شان بەشانی رەوتی وتوویژ ومامەڵە دەژی ولەهەندێك ولاتدا رەوتەکە خۆی فەرمانڕەوایە.

رەوتی بنەبڕکردن بەچینی فەرمانڕەوا ناوەستێت بەڵکو تەنانەت لەناو ئەوانەی بە ((رۆشنبیر)) ناسراون بۆ نموونە نووسەرێکی چەپڕەوی وەك دکتۆر سەمیر ئەمین کەجیاوازی نێوان ((توندڕەو)) و ((میانڕەو))ە ئیسلامییەکان ناکات وبەعەقڵیەتی پاکتاوکردن بیردەکاتەوە [٣٣].

## ئیرهابییەکان ئیدانەی ئیرهاب دەکەن

ئەنجامی دەستگرتن بەسەر بەشی گەورەی هۆکاری راگەیاندن ئەوەیە خەڵکی گوێ بۆ ئەو کەسە دەگرن کەدەنگی بەرزترە. ئیرهابییە راستەقینەکانیش خەڵات ونەفرەتی خۆیان دابەش دەکەن ولیستی ناوی ئیرهابییەکان دادەبەزێنن.ساڵی ١٩٩٦ لوتکەی (شرم الشیخ) کەپێشتر ئاماژەمان بۆ کرد بۆ دژایەتی کردنی ئیرهاب بەسترا.

جگە لە (١٤) ولاتی ستەمکارو سەرکوت کەری عەرەبی (١٤) ولاتی تر بەشداری کرد: ئەمریکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ئیسپانیا، ئایرلەندا، بەلجیکا، نەرویج، رووسیا، ئیسرائیل، کەنەدا، تورکیا، ژاپۆن. هەر یەکێکیش لەم ولاتانە جگە لە ئایرلەندا ونەرویج وکەنەدا یان موستەعمەراتیان هەبووە ویان خاکی گەلێکی تریان داگیرکردووەو شێوازە جۆراو جۆرەکانی تۆقاندن ولەناو بردن وئەشکەنجەدانیان پیادە کردبوو و دەیکەن.

هەر یەکێکیش لەمانە جەنگی تەعداکارانەی بەرپا کردبوو، رەنگە لەبەر ئەمەش بوو لوتکەی ئەو ولاتانە ناونرا ((لوتکەی دروستکەرانی ئاشتی))!!

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەبەیاننامەی کۆتایی لوتکەکەدا باس لەرێگەگرتنە لەدوژمنانی ئاشتیی (عەرەب – ئیسرائیل) لەوەی ئاشتی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تێك بدەن بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو سەرۆك وەزیرانی ئەوسای جوولەکە (بنیامین نتنیاهۆ) بووە هۆی ئیفلیج بوونی پرۆسەی ئاشتییەکە بەڵام هیچ ئیجرائێکی لەگەڵدا نەکراو بەتێکدەری ئاشتی ناونەبرا.

سەبارەت بەئەمریکاش کە چەکی تۆقاندنی هەمیشە لەکاردایە لیستێکی بڵاوکردبووەوە بەناوی ژمارەیەك رێکخراو و بەئیرهابی ناویان دەبات. جێگەی تێبینیە (لیستەکەش هەمووی جێگەی تێبینیە) کە (پەکەکە) بەئیرهابی زانراوەو کۆمەڵە چەکدارەکانی باشووری سودان ناویان نەهاتووە هەر چەندە هەردوو لایەنەکە بۆ یەك مەبەست کاردەکەن و زەبرو زەنگی تورکیا هەزار قاتی ئەوەی سودانە.پەیوەندیی باشی تورکیاو دوژمنایەتی ئەمریکا بۆ سودان دوو شتی ئاشکران ومەبەستی لیستەکە ئاشکرا دەکەن.

تێبینیەکی تری لیستەکە هاتنی ناوی (موجاهیدین خەلق)ی نەیاری ئێران لەناو لیستەکەدا هەرچەندە دەزانین ئێران وئەمریکا دژ بە یەکترن ودەبوایە ستایشی (موجاهیدین خەلق) بکرایە نەك بە ئیرهاب لەقەڵەم بدرایە.

لەراستیشدا پێویست دەکات بۆ ئەوەی لیستەکە ((بێ لایەن))بێت ناوی رێکخراوی وا بهێنێتەوە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە رێکخراوی (موجاهیدین خەلق) سەر بەعیراقە (دوژمن ئەمریکا)و پەیوەندیی پتەوی هەیە لەگەڵ فەرەنسا (مونافسی ئەمریکا). ئەمەش پەیامێکە بۆ هەموو رێکخراوەکان: دەبێت هەموو ئیرهابییەکان لەدەوری ئەمریکادا کۆبنەوە.

## ئیرهابی ئەمریکی لەودیو سنوورەکان

ئەمریکا، ئەو قازییەیە کە دادگای داناوەو حوکمی سێدارەی ئامادەیەو ئامادەبوونی پارێزەری لاقبووڵ نییە. ئەمریکا راوکەری ئیرهابییەکان، ئەو دەوڵەتەیە کەچەندین شێوەی ئیرهابی دژی گەلان خستۆتە کار.

دەستختنە ناو کاروباری ولاتان تارادەی نەخشەکێشان بۆ کودەتای سەربازی وتا رادەی ناردنی سوپای خۆی بۆ ناو ولاتان کارێکە وشەیەکی بۆ بەکاردەهێنرێت کە وەسیلەکانی راگەیاندنی ئەمریکا وێنەیەکی ناشیرینی وەك وشەی ئیرهابیان پێ نەبەخشیوە. ((دەست تێوەردان)) وشەیەکە ئەوەندەی وشەی ((ئیرهاب)) قێزەون نەکراوە. لەسەدەی نۆزدەوە ئەمریکا دەستی

لەکاروباری ولاَتاندا وەرداوە لەناردنی لەشکرەوە تارێکخستنی کودەتای سەربازی، لەشکر بۆ نیکاراگوا، کوبا، گواتیمالا، گرینادا، سان دومینگۆ، بەرازیل، ئیکوادۆر، چیلی، هێزەکانی خۆی رەوانەی فلیپین، ژاپۆن، کۆریا، ڤێتنام لەئاسیادا کردبوو.ئەمریکا جەنگی دژی (لیبیا) لەسەدەی نۆزدەدا بەرپاکردبوو کە یەکەم جەنگی دەرەوەی ئەمریکا بوو پاش سەربەخۆبوونی لەبەریتانیا [٣٤] .

شۆڕش دژی ئەمریکا ئیرهابە هەروەکو ئیرهابی شۆڕشەکانی دژی داگیرکەری بەریتانی وفەرەنسی و ئیتالی وبەلجیکی وهۆڵەندی...تاد. ئەمڕۆ رەفزکردنی هەیمەنەت وسەروەریی ئەمریکا ئیرهابە.مێشك شۆراوی زۆریش لەم ولاَتانەدا ئەم تۆمەتی ئیرهابە دووبارە دەکەنەوە.

## یاسایەکی جاهیلی

یاسایەکی خوداییە کەفەرمانمان پێدەکات ((وان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به)) بەلاَم یاسای جاهیلی قەناعەت بەتۆڵەی هاو ئەندازە ناکات. حزبی بەعس زووتر وتبووی (ئەوەی بەرد بگرێتە ماڵمان ئێمە دەکێشین بەسەر سەقفی ماڵەکەیدا) بەعس ئەمەی راگەیاندبوو وبەئەمانەتەوە چەسپاندبووی.

ساڵی ١٩٤٥ لەجەزائیردا (٨٨) کەس لەو داگیرکەرە فەرەنسایانەی زەویی جەزائیرییەکانیان زەوت کردبوو کوژران و (١٥٠)ی تر زامدار بوون. تۆڵەی فەرەنسییەکان زۆر دڕندانە بوو. (٤٥) هەزار جەزائیرییان کوشت، تەعەدای ناموسیان کرد، سکی ئافرەتە دوو گیانەکانیان هەڵدڕی [٣٥] . لەفەلەستیندا سەرۆکی ئیسرائیلی (عزرا وایزمان) لەبارەی خۆونکردنی ئەندامانی (حەماس) لەناو هاوولاَتییە فەلەستینییەکان پاش هەر چالاکییەك دەڵێت: کاتێك ناتوانی دەرزییەك لەناو مەڵۆیەك گیادا بدۆزیتەوە پێویستە هەموو مەڵۆکە بسووتێنی [٣٦] ئەم یاسا جاهیلییە کەمەبەستی یەکەمی تۆقاندنی نەیارە ناوی تۆقاندن وئیرهابی لێ نانرێت چونکە بەهێزەکان دەیکەن.

## بەرگری لەئیرهابییەکان

لەبەر ئەوەی دەزگایەکی بێ لایەن نییە وەسفی ئیرهابی بچەسپێنێت بەسەر ئەوانە شایستەی وەسفەکەن" ناونانی ((ئیرهابی)) و ((میانڕەو)) و ((یاخی بوو)) و ((سەربەخۆی خواز)) لایەنگیریی پێوە دیارە.

لەلیستە ئەمریکییەکەی رێکخراوە ئیرهابییەکاندا ناوی رێکخراوی (یونیتا) کەدژ بەحکومەتی چەپڕەوی ئەنگۆلا دەجەنگێت ولەشکرەکەی (جۆن گارانگ)ی نەیاری حکومەتی ئیسلامیی سودان نەهێنراوە.

ئەوساش ئەمریکا پێشوازیی لە (مناحیم بیگن)ی کۆنە ئیرهابی وتازە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی دەکرد. (بیگن) کەسەرکردەی رێکخراوی ئیرگۆن (ئیتسل) بوو کەلە (دێر یاسین) (١٩٤٨) و بەهاوکاری کۆمەڵەی (شتێرن) قەسابخانەیەکی بەرپا کردو تیایدا (٣٠٠) منداڵ وئافرەت کوژران و لاشەکانیان شێوێنران وفرێدرانە بیرێك. بیگن شانازیی بەوە دەکرد کە قەسابخانەکانی ئیرگون بوونە هۆی ئەوەی (٦٣٥) هەزار هاوولاَتی فەلەستینی وەکو شێت هەڵبێن [٣٧] .

هەموو تاوانەکانی جوولەکە بەبێ دەنگی یان ئەو پەڕەکەی بەرەخنەیەکی شەرمنانە وەلاَم دەدرێنەوە. هێشتا ئەو رەخنە شەرمنانەش زۆر دەگمەنن. ئایا کوشتنی چوار کوردی ئەڵمانیا لەبەردەم کونسڵخانەی جوولەکە لە بەرلیندا پاش گرتنی ئۆجەلان لەیادی کەسدا ماوە؟ توێژینەوەکانی پۆلیسی ئەڵمانیا دەریخسبوو خۆپیشاندەرە کوردەکان دانیشتبوون و بەبێ هیچ هۆ تەقەیان لێ کراو پەلاماری کونسڵخانەکەیان نەدابوو.

ئیرهابی جوولەکە دیفاعی لێ کرا.کوژرانی ژمارەیەك جوولەکە وەك وتمان شایستەی بەستنی کۆنگرەی (شرم الشیخ)بوو لەکاتێکدا فەلەستینییەکان هیچ نرخێکیان بۆ دانانرێت. ناشزانین کاردانەوەی ئەمریکا چی بووە بۆ ئەو بڕیارەی دادگایەکی ئیسرائیل کەدوو سەربازی ئیسرائیلی جەزا دا لەبەر ئەوەی فەلەستینییەکیان کوشتبوو. جەزاکە (٢٥) سەنت (کەمتر لەپێنج دیناری ئەمڕۆمان) و یەك سەعات سجن کردن بوو. ئەو پیاوە ئاینییە جوولەکەیەی ئەمەی باس کردووە دەڵێت ئەو حوکمە گەرێنرایەوە بۆ دادگاکە تا پیایدا بچێتەوە [٣٨].!! چوار کوردە کوژراوەکە (٢٥) سەنتەکەش نەکرایە جەزا بەسەر بکوژەکانیان!

# توندڕەوی.. ئیرهاب.. گۆڕینی جیهان

## بەشی دووەم

### بەرایی

هەر کۆمەڵگەیەك بینای ئابووری‌و سیاسی‌و داب‌ونەریت‌و بیروباوەڕو ئاینی خۆی هەیە. سەرجەم تاکەکان لەگەڵ ڕەوتی ئەو کۆمەڵگەیەدا دەڕۆن، بەڵام زۆرجاریش روو دەدات کەسێك یان تاقمێك دژ بەو تەوژمە مەلە بکەن.

ئەو کەسانە هەوڵی بەدیهێنانی گۆڕانکاری دەدەن، ئیتر ئایا گۆڕانکارییەکی هەمەلایەنە بێت یان تەنیا ڕوویەکی کۆمەڵگە بگرێتەوە.

وەك چاوەڕوان دەکرێت" کۆمەڵگە یان بەشێکی ئەو کۆمەڵگەیە کاردانەوە دژی ئەم هەوڵی گۆڕانکارییە دەنوێنێت، لەمەشەوە ململانە سەرهەڵدەدات.

ئەگەر باس لە ئاستێکی باڵاتر لە تاکە کۆمەڵگەیەك بکرێت، ئەویش ئاستی جیهانی، هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری ململانەیەکی گەورەتر بەرپا دەکات.

### دیموکراسی‌و شۆڕش

زووتر سۆشیالست‌و کۆمۆنیست‌و فەوزەوییەکان کۆششیان بۆ گۆڕینی باروۆخی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی دابوو و باسیان لە شۆڕش دەکرد... ئەوەش کە کەمتر باسی لێوەکراوە ئەوەیە دیموکراسی ڕێگەی شۆڕشی گرتبووە بەر.

دیموکراسی وەکو بەرامبەرێك‌و رەت کردنەوەیەکی توندوتیژی زانراوەو ڕێگەی دیموکراتی وەکو بەدیل بۆ ڕێگەچارەی شۆڕش تەماشا دەکرێت. بەڵام ئەوەی لەیادکراوە مێژووی دیموکراسییە. دیموکراسی لە سەددا سەد ئاشتییانە خۆی نەسەپاند.

ئەزموونی یەکەمی دیموکراسی، کە دیموکراسییەکەی وڵاتی یۆنانەو کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەك بەر لەمەسیح لە ڕێگەی ململانێی کۆمەڵایەتییەوە هاتە بوون.

لەو ناوچانەداو بەهۆی بینای عەشایەریی کۆمەڵگەوە چینە باڵادەستەکە دەسەڵاتێکی کەمتری بۆ حاکمێکی تاك دەهێشتەوە بەڵام بە تێپەڕبونی زەمەن جیاوازیی نێوان چینەکانی کۆمەڵگە ململانێی نێوانیان دروست کردو ئەنجامی ئەو ململانێیە گۆڕانکاری بوو بەسەر شێوازی حوکم‌و دابەش کردنی دەسەڵاتەکانداو چەند جۆرە حوکمێك سەریان هەڵدا کە شێوازی دیموکراتی یەکێکیانە.

بەسەرهاتەکانی لەپشت ئەم سەرهەڵدانە بریتی بوون لە ناکۆکی‌و شەڕو شۆڕش‌و دژەشۆڕش‌و کودەتا... تاد.

خولی دووەمی دیموکراسی کە دوای دوو هەزار ساڵ دەستی پێکرد بە هەمان شێوە شەڕو خوێن ڕشتنی تۆمارکرد. مێژووناسان بۆ ئەم خولە سێ ڕووداو وەك ڕووداوی گەورەی دیموکراسی دەست نیشان دەکەن. یەکەم ڕووداو لەمانە شۆڕشی ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەدا کە بریتی بوو لە ململانەی نێوان لایەنگرانی پەرلەمان‌و لایەنگرانی پادشا چارلزی یەکەم‌و کە بەشەڕ کۆتایی پێهات.

دوای ئەوەو ساڵی (١٧٧٦) شۆڕشی ئەمەریکی دژی داگیرکەری ئینگلیزی هەڵگیرساو ئەنجامی شۆڕشەکە پاش چەند ساڵێك دامەزراندنی کۆماری فیدراڵیی ئەمەریکاو پێکهێنانی کۆنگرس بوو.

لە هەمان ئەو ساڵەی هەڵبژاردنی یەکەم کۆنگرەس و سەرۆك کۆماری ئەمەریکی (١٧٨٩ساڵی) کرا شۆڕشی فەڕەنسی بەرپادەبێت و پادشایەتییەکی دەستووری دادەمەزرێت و کە دواییتر بووە نیزامێکی کۆماری و لەمەش دواتر ژمارەیەك گۆڕان بەسەر نیزامی دەوڵەتەکەدا هات.

هیچ لەم شۆڕشانە ناوی دیموکراسییان بەکارنەهێنابوو بەڵام هەموویان چوونە خانەی دەستکەوتە دیموکراتییەکان و زەمینەیان بۆ دیموکراسیی سەدەی نۆزدەو سەدەی بیست خۆش کرد.

کەواتەو وەك وتم ئەو دیموکراسییەی دەیانەوێت بەدیل بێت بۆ شۆڕش و توندوتیژی لە ڕێگەی شۆڕشەوە خۆی سەپاند. دیموکراسییە سەقامگیرو هێمنەکەی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا بەری هەموو ئەو ڕووداوە گەورانەیە. خوێنرشتن کارێکی پێویست بوو بۆ دیموکراسی. شۆڕشی ئەمەریکی جەنگێك بوو وەکو هەموو ئەو جەنگانەی کوشتاریان لێ دەکەونەوە. لە شۆڕشی ئینگلیزیشدا خوێنی هاووڵاتییە بەریتانیاییەکان و وەکو هەموو جەنگێکی ناوخۆ ڕێژراو لەسێدارەدانی پادشا چارلزی یەکەم (ساڵی ١٦٤٩) تەنها ڕووداوێکی شۆڕشەکە بوو. شۆڕشی فەڕەنسیش توندوتیژی و کوشتارێکی نموونەیی بەخۆیەوە بینی و یەکێك لە سەرژمێرییەکان قوربانییەکانی سەر دەستی پیاوانی شۆڕشی نێوان (٣٥) تا (٤٠) هەزار مەزەندە کراوەو تەنها لە ناوچەی (ڤوندێ) کە ڕاپەڕینێکی دژ بە شۆڕش هەڵگیرسابوو (١٧) هەزار کەس کوژران[٣٩].

لەیادکردنی ئەو مێژووە سوورەی دیموکراسی ئەو ڕاستییە دەشارێتەوە کە بارودۆخی ڕۆژهەڵات زەمینەیەکی ناسازە هەروەکو زەمینەی ئەوسای ڕۆژئاواو لەمەوە شۆڕش و خوێن ڕشتن بۆ سەپاندنی دیموکراسی پێویستە.

ئەمە یەکەم کێشەی نەزەریی هێنانەدیی دیموکراسییە لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام پاشان کێشەی تر سەرهەڵدەدەن: کێ ئەم خوێنە دەڕێژێت؟ پاش سەرکەوتن زەمانەت چییە بۆ ئەوەی سەرکەوتوو نەبێتە دیکتاتۆر لەجیاتی بەرقەرارکردنی دیموکراسی؟ پاش سەرکەوتن دەوڵەتە گەورە دیموکراتەکان لێدەگەڕێن نیزامەکە پرۆژەی دیموکراتیی خۆی پیادە بکات ئەگەر دەرکەوت کە نیزامەکە هەڕەشە لە بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانیان دەکات؟ ئەگەر ئەمە ڕوویدات شۆڕشی دیموکراتی پێویستی بە خوێنی ترە چونکە ململانەی تر سەری هەڵدەدەن.

واز لەم حساباتە بهێنین و حسابێکی نەزەریی تر بکەین کە هۆکارێکی گەورەی توندوتیژی و دواتر ئیرهاب دەست نیشان دەکات و بزانین ڕێگەچارەی دیموکراتی و ئاشتییانە لە زۆربەی هەرە زۆری حاڵەتەکاندا تاك و لۆ دەبێت:

تۆ دەتەوێت گۆڕانکاری بەسەر کۆمەڵگە یان لایەنێکی ئەو کۆمەڵگەیەدا بهێنیت. بەپێی بانگخوازان ئازادی کارەکەت ڕەوایە. هەوڵی خۆت دەدەیت بەڵام هەندێك کەس وهێز بەرەنگارت دەبنەوە. ئەگەر ڕێگەی کارت پێ درا پێویستت بە توندوتیژی نابێت بەڵام چی دەکەیت ئەگەر ڕێگەی کاری ئاشتیانەت لێ گیراو گەیەنرایتە (ڕێگەیەکی داخراو)؟

هیچ بیریارێك یان فەیلەسووفێك ناڵێت خۆت بکوژە یان دەستبەرداری ئامانجەکەت بە، هەرچەندە هەموویان ئامۆژگاریشت ناکەن دەست بدەیتە چەك.

کەس ناڵێت لەناو زینداندا خەبات بکەو لە کۆتاییدا دەنگی زیندان بەسەر زەبری دەسەڵاتدا سەردەکەوێت چونکە ئەم حاڵەتە دەگمەنەو کەسێك خۆی بە ژیر بزانێت شوێنی ئحتمالە دەگمەنەکان ناکەوێت. تا ئێستاش و ئەوەندەی بزانین کەم کەس توانیویانە ڕێگە چارەیەك بۆئەوەی وتمان (واتە حاڵەتی ڕێگەگرتن لە خەباتی ئاشتییانە) بە ڕاشکاوی بڵێن چونکە دوو ڕێگە هەن و هەردووکیان ئازایەتییان پێویستە بۆ ئەوەی وەکو ئامۆژگاری ئاڕاستەی خەباتکاران بکرێن: یان دەست بدەرە چەك و یان مردنێکی هێواش بۆ خۆت هەڵبژێرە.

با بڵێین ڕێگەی شۆڕشت گرتەبەر، کە زۆرجار کارێکی ناچارییە، ئەوکاتە پێویستە ئامادەی ئیجرائاتی توندوتیژی بەرامبەرەکەت بیت، ئەمەش بەپاڵ جەنگێکی ئیعلامی کە بەکارهێنانی وشەی (ئیرهابی) لە دژت یەکێکە لە شەڕەکانی ئەو جەنگە. ڕەنگە تۆش پێش وەخت چاوەڕێی کۆسپەکانی سەر ڕێگە بێت بۆیە خۆت پێشتر بۆ شۆڕش ئامادە بکەیت. لە هەموو حاڵەتەکانیشدا تاوانباریت و پێویستە پێوانەی خۆت بۆ شەرعی زانینی خەباتەکەت هەبێت.

شۆڕش وەکو ڕێگەچارە باوەڕێکە لەسەر زمانی زۆر کەساندا هاتووە. لە سەردەمی شۆڕشەکانداو بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەو بەشی هەرە گەورەی سەدەی بیستی زاینیدا ئەمە دەوتراو لە ساتەکانی دوایی‌ی کۆتایی سەدەی بیستەمەوە تا ئەمڕۆ وشەکانی شۆڕش‌و گۆڕینی واقع بە چەك رووەو قیزەون کردن دەبرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا جیهان لەم جۆرە کەسانە بەتاڵ نەبووە. نموونەیەکی نوێ ئەنجامدەرێکی تەقینەوەی ساڵی (١٩٩٥)ی شاری ئۆکلاهۆمای ئەمەریکی (تیمۆثی مەکڤێ) کە ئەو قسەیەی وتبوو کە لە مێشکی زۆربەی شۆڕشگێڕاندا هەیە: پێویستە خوێن بڕێژرێت لە پێناوی گۆڕینی واقعە داروخاوەکە[٤٠] .

## مافی شۆڕش

زانیمان شۆڕش یەکێك بوو لە هەنگاوە یەکەمەکانی دیموکراسی و پرۆژەی گەورەی سۆشیالیزم‌و بە تایبەتی مارکسیەت بوو. ئەم شۆڕشە تا ساتی گەیشتن بە ئاوات (کە بە زۆری دەستکەوتنی دەسەڵاتە) رەوایەو لەوەبەدوا شۆڕشگێڕ کە زووتر ناوی یاخی بووی لێ نرابوو دەبێتە پارێزەری واقعە نوێکەو نەیارانی ئەو واقعە دەبنە یاخیبوو.

ئەمەمان لە هەموو شۆڕشەکاندا بینی، لە شۆڕشە قەومییەکان، لە شۆڕشە کۆمۆنیستەکان، لە کوردستاندا ئەمەمان بینی، لە هەموو شوێنێکدا ئەمە هەیە. شۆڕشگێڕو یاخی بوو، پۆلیس و تاوانبار جێگۆڕکێ دەکەن، دوو هاوڕێی زیندانیش تاسەر هەردووکیان وەکو شۆڕشگێڕ نامێنن. وەکو پەیامنێری گۆڤاری (لانوڤێل ئۆبزێرڤاتور)یش لە بارەی دوێنێ‌و ئەمڕۆی فەلەستینییەکان دەڵێت: ئەوسا لە یەك زیندانی ئیسرائیلیدا ئەندامێکی ڕێکخراوی فەتحی سەر بە یاسر عەرەفات لەگەڵ ئەندامێکی حەماسدا دەژیان بەڵام ئەمڕۆ یەکێکیان پۆلیسەو کۆتوزنجیر دەخاتە دەستی هاوڕێی زیندانی خۆی[٤١] .

مافی شۆڕش‌و ناڕەوایەتیی شۆڕش کەسەکانی ناو ململانێکە دیارییان دەکەن‌و تیۆر و لێکۆڵینەوەو بەیاننامەی دان نان بە مافی شۆڕش لەبەردەم واقیعی ململانەکە شکست دەهێنن.

بیریاری ئینگلیزی جۆن لۆك (١٦٣٢-١٧٠٤ز) یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی لیبراڵیەت‌و باوەڕی وابوو پەیمانێك لەنێوان پادشاو ژێردەستەکانیدا هەیەو ئەم ژێر دەستانە بۆیان هەیە شۆڕش دژی هەر پێشێلکارییەکی یاسا بەرپا بکەن (٤٢)، بەڵام هەر (لۆك) خۆی بوو کە داوای قەدەغەکردنی هەردوو (پاپەویەت)و بێباوەڕی کردبوو [٤٣]، کەسێك باوەڕی وا بێت تاقمێکی وڵاتەکەی لە مافەکانیان بێبەش بکات بێگومان مافی شۆڕشیان پێ ڕەوا نازانێت.

شۆڕشی فەرەنسیش (١٧٨٩) کە مافی هاووڵاتیی ڕاگەیاند، لە بەندی دووەمیدا ـ هەروەها دوای ئەوە لە ماددەی (٣٥)ی ڕاگەیاندنی ساڵی (١٧٩٣) ـ مافی بە هاووڵاتی دەدا شۆڕش بەرپابکات بەڵکو دوو ماددەکە ئەمەیان بە ئەرك دەزانی [٤٤]، بەڵام بینیمان کە هەر پیاوانی شۆڕش بوون دژە شۆڕشەکەی (ڤۆندێ) وشوێنی تریان خەڵتانی خوێن کردو بە جوملە هاووڵاتییان لەسێدارە دەداو گوللەبارانیان دەکردن.

لە شۆڕشی سەربەخۆبوونی ویلایەتە ئەمەریکییەکان (ساڵی ١٧٧٦) بەیاننامەی سەربەخۆبوون بڵاوکرایەوەو لە پێشەکییەکەیدا تەئکید لەسەر مافی بەرپاکردنی شۆڕش لەلایەن گەلەوە کرا بەڵام پاش ماوەیەك زنجیرە شەڕە تەعداکارییەکانی ئەمەریکا دەستیان پێکردو ئەمەریکا لەو کاتەوە سەرکوتکەری شۆڕشەکانی جیهانە.

پاش هەموو ئەمانەش خەباتی چەکداری ئەوروپییەکان دژی داگیرکەری نازی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا پیرۆزکرا وەك چۆن پێشتر و دواتر هەمان خەباتی چەکدار، بەڵام ئەم جارە دژی ئەوروپای داگیرکەرو ڕژێمە پابەندبووەکانیان، ئیدانە کرا. دەبوایە ڕۆژئاواییەکان ئەمانەتیان بۆ بنەماکە هەبوایە بەڵام نە ئەمەیان کرد ونە پێوانەیەکی دادپەروەرانەیان خستەڕوو.

ئەگەر باس لە ئیسلام بکەین شۆڕش زیاتر بە ناوی (خروج) هاتبوو و مەسەلەی (خروج) دژی ئەمیری ستەمکار مەسەلەیەك بوو راوبۆچوونی جیاجیای لەسەر هەبوو. رای کۆنی سەلەفیش ئەوە بوو کە شۆڕش دژی سوڵتانی ستەمکار ڕەوایە، بەڵام دوایی زانایان هاتنە سەر قەدەغەکردنی چونکە فتنەو خوێنرشتنی بەدواوەیە. ئەمەش ئەگەر کوفری ئاشکرا لەو سوڵتانە دەرنەکەوێت چونکە لە حاڵەتی کوفری ئاشکرادا شۆڕش‌و لابردنی ئەو ئەمیرە نەك تەنها ڕێگەپێدراوە بەڵکو واجبیشەو جائز نییە گوێڕایەڵیی ئەو سوڵتانە بکرێت. (ابن حجر) کە قسەی زانایان لەم بارەیەوە دەهێنێت دەڵێت: (ابن التين) لە (داودی)یەوە نەقڵی کردووە کە دەڵێت: زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە ئەگەر بکرێت ئەمیری ستەمکار بێ فتنەو بێ زوڵم لابرێت، لابردنی واجبە ئەگینا ئەگەر ترسی ئەمانە هەبوون واجب ئەوەیە سەبر لەسەر ئەمیرەکە بگیرێت. هەروەها ئەو ڕایەش هەیە کە هەر لەسەرەتاوە نابێت ویلایەت بە فاسق

بدرێت، لەبارەی ئەوەشەوە ناڕێك بوون كە ئەگەر حاكمەكە پاش ئەوەی فەرمانڕەوایەتیی گرتە دەست زوڵمی بەرپاكرد ئایا جائزە دژی راپەڕن یان نا[٤٥] .

شیاوی وتنە كە هەرچەندە ئەمەوییەكان كوفریان لێ نەوەشابووە بەڵام الحسین كوڕی عەلی (خودا لە هەردووكیان رازی بێت) لە دژی یەزید كوڕی موعاویە خروجی كردو پاشان (عبدالرحمن كوری الاشعث) دژی حەجاج شۆڕشی بەرپاكرد بەڵام زانایان هیچ لەمانەیان بە (باغی)و یاخیبوو نەزانیوە[٤٦] .

لێرەدا دەبینین چۆن حوكمی ئیسلام لەبارەی شۆڕشەوە چەند روون و ئاشكرایە:

١-شۆڕش دژی ئەمیری كافر واجبە.

٢-شۆڕش دژی ئەمیری ستەمكار بۆچوونی جیاوازی لەسەرە.

ئەمەش بەپێچەوانەی راوبۆچوونە غەیرە ئیسلامییەكان كە مافی شۆڕش بەو كەسانە دەدرێن كە جێگەی مەبەستن و جەنگی ئیعلامی دژی ئەوانەی تر دەكرێت.

## كوشتنی ستەمكار

یەكێك لەو كارە توندوتیژانەی هاوڕێ لەگەڵ شۆڕش و شەڕی چەكدارانەدا ( جاری واشە بێ ئەو شەڕە چەكدارە) پیادە دەكرێت كوشتنی بەرپرسان و دەسەڵاتدارانە. ئەم كوشتنەی كە بە زمانی ئەمڕۆ بە تیرۆر (ئیرهاب) ناودەبرێت پاساوێكی دیموكراتیی كۆنی هەیە.

چەمكی كوشتنی ستەمكار Tyrannicide مافێك بوو لە سیاسەتی یۆنانی و رۆماییدا. كسینۆفۆن و ئەفلاتوون و ئەرستۆ پاساویان بۆ كوشتنی ستەمكار هێنابووەوە. (دیمۆستێن)ی خەتیبی ناوداری (ئە ثینا)ش ئەم كارەی بە دڵسۆزی بۆ دیموكراسی زانیبوو [٤٧] .

لەم روانگەیەشەوە (بروتوس)و هاوڕێكانی (یولیوس قەیسەر)یان كوشت. ئەم بكوژانە بینییان (رۆما) رووەو حوكمی تاكڕەوی دەڕوات و حوكمی كۆماری لەژێر سایەی قەیسەردا كەوتۆتە بەر مەترسی.

پێویستە ئەوە بڵێین كە وشەی (ستەمكار) وەرگێڕانی پیتاوپیتی وشە كۆنەكە نییە و كە ئەمیان لە عەرەبیدا بە (طاغیة) وەرگێردراوە و كە ئەمەش دیسان تەواو نییەو هەندێك جار بە (مُستَبِد) - كە ئەمیان راسترە – وەردەگێردرێت. ئەو (مستبد)ە كەسێك بوو لەو سەردەمەدا زیاتر پشتی بە جەماوەر دەبەست بۆ خستنی حوكمی چینە باڵادەستەكە (ئەشراف)و حوكمێكی تاكڕەوانەی پیادە دەكرد، تاكڕەوانە لە جەوهەردا ئەگینا هەندێك جار دادو دەزگا دیموكراتییەكانی دەهێشتەوەو تەنانەت ژمارەیەك لەم ستەمكارانە دەبوونە مایەی پێشخستنی وڵاتەكە.

ئیتر ئەگەر بە پێوانەی دیموكراسییەكەی زەمانی زووتر كوشتنی ستەمكار خزمەت بە دیموكراسی بووبێت (زیاتریش لەم بارەیەوە مەبەست لە وتەی دیمۆستێنە وەك لەوانەیتر) ئەی دەبێت كوشتنی ستەمكاری هاوچەرخ و بە هەمان پێوانە دیموكراتییەكە چەند كارێكی پیرۆز بێت؟

دواییترو لە فیكری نەصرانیدا (تۆمای ئەكوینی)ی لاهووتناسی نەصرانی (سەدەی ١٣ی زاینی) باوەڕی وا بوو كوشتنی ستەمكاران وەسیلەیەكە بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیی گشتی [٤٨] .

بەم شێوەیە بەشێك لە بیریارانی یۆنانی كۆن و فیكری نەصرانی مەسەلەكەیان بە تەمومژاوی نەهێشتەوە وەك چۆن دیموكراسیی نوێ هێشتوویەتیەوە. دیموكراسیی نوێ ئەگەر ئیدانەی كوشتنی ستەمكار بكات خیانەت بە ئیرادەی گشتی دەكات و ئەگەر رێگەی پێ بدات خیانەت بەو دروشمە بریسكەدارانە دەكات كە بە ئاشكرایی بەرزیان دەكاتەوە.

## كۆشش بۆ گۆڕانكاری لە رۆژئاوادا

كاتێك بینای سەر بە حكومەتی فیدراڵی (مەركەزی)ی ئەمەریكی لە شاری ئۆكلاهۆمادا ساڵی (١٩٩٥) تەقێنرایەوەو زیاتر لە (٢٣٠) كەس لەو تەقینەوەیەدا كوژران تۆمەتەكە یەكسەر خرایە پاڵ ئیسلامییەكان، واتە مەترسییەكەی ئەودیو سنووری ئەمەریكا، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو دەركەوت ئەنجامدەرانی كارەكە كەسانی ئەم دیو سنوورن و هاووڵاتیی رەسەنی ئەمەریكین.

ئەو میلیشیا راسترەوی لەپشت تەقینەوەكە بوو یەكێكە لە ژمارەیەكی زۆری رێكخراوی هاوجۆر كە دژ بەحكومەتی فیدراڵی (مەركەزی) كاردەكەن و لە سەرەتای نەوەدەكانی سەدەی بیستدا زیادیان كردبوو و بەراددەیەك بەهێزببوون كە نزیكی سەد هەزار ئەندامیان لە خۆ كۆكردۆتەوە [٤٩] . (ئەم قسەیەش ساڵی ١٩٩٥ وتراوەو دیارە ژمارەكە ئەمڕۆ زیاترە).

ئەو ڕێکخراوانە کارتێکەرێکی ئایینیان لەسەرەو بە زۆری لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ناوەڕاستی ئەمەریکادا هەن کە تیایاندا بەها ئایینییەکان و دابونەریت و هاوکاری نێوان دراوسێکان باشترین پارێزەرن دژی کارو تەعدادی کەسانی دەرەوەی خۆیان [٥٠] . ئەو ناوچەیەش (پشتێنی تەورات)ی پێ دەوترێت [٥١] .

هەندێك لەمانە عیادەی ئەو دکتۆرانە دەتەقێننەوە کە بە کاری لەباربردن هەڵدەستن و تەنانەت دکتۆرەکانیش دەکوژن.

لە ڕۆژئاوادا ڕێکخراوی سەیرتر هەن. جۆرێك لەوانە کاری توندوتیژی دژ بەو دکتۆرانە بەرپا دەکەن کە ئاژەڵەکان دەکەنە بابەتی توێژینەوە پزیشکییەکانیان و وەکو باسێکی سەیرو سەمەرە لێرەدا لەبارەیانەوە دەدوێین.

ئەم بزافەی (مافی ئاژەڵان) بە وتەی چەند پزیشکێك هەڕەشە لە زانستی پزیشکی دەکەن و [٥٢] شێوازی جۆراوجۆری دژایەتی پیادە دەکەن کە لە بەکارهێنانی ڕێگەی یاساییەوە دەست پێ دەکەن تا دەگەنە ئەنجامدانی کاری توندوتیژ. ئەو ڕێکخراوانە بەکارهێنانی ئاژەڵ بۆ توێژینەوەی پزیشکی بە لەناوبردنی جوولەکە دەشوبهێنن [٥٣].



گۆڕی دوو هەرزەکارە تاوانبارەکەی (لتڵتۆن)و قوربانییەکانیان

یەکێك لە دەستکەوتەکانی ئەو ڕێکخراوانە کە لە ڕێگەی یاساوە دەستەبەریان کردووە قەدەغەکردنی فرۆشتنی سەگ و پشیلە بۆ مەبەستی توێژینەوەی پزیشکی لە(١٣) ویلایەتی ئەمەریکا [٥٤] (ئەم قسەیەش لە ساڵی ١٩٩١).

بەپاڵ ئەم وەسیلە یاساییانە، ڕێکخراوەکان بۆمب دەتەقێننەوەو بیناکان تێك دەدەن و دەیانسوتێنن و ئاگر بەردەدەنە ئەزموونگەکان و کۆمپیوتەرەکان دەشکێنن و ئاژەڵەکان بەرەڵا دەکەن. لە ئەنجامی کاری واشدا ئاژەڵەکان دەخرێنە ژێر چاودێری، بۆ نموونە لە زانکۆی (ستانفۆرد)دا مشکەکان بیست و چوار سەعات لەژێر حەراستدان!

نموونەیەکش لەسەر کاری توندوتیژیی ئەو کۆمەڵانە ئەوەبوو ساڵی (١٩٩٠) لە بەریتانیادا بۆمبێك خرابووە ژێر سەیارەی ئافرەتێك کە پزیشکی بەیتەری بووو ئەمە بووە هۆی برینداربوونی. یەکێك لە ڕێکخراوەکان دانی نا بەکارەکەو وتی جێگەی ئەسەفە کە ئافرەتەکە ماوەو نەمردووە. بۆمبێکی تریش خرابووە ژێر سەیارەی توێژەرەوەیەکی زانکۆی (بریستوڵ)و لە ئەنجامدا منداڵێکی (١٣) مانگانە لەو نزیکانە بریندار ببوو.

نموونەیتر وتەی سەرکردەیەکی (بەرەی ئازادکردنی ئاژەڵان) لە بارەی توێژەرەوەیەکی ترەوە کە دەڵێت: ئەو توێژەرەوەیە چەند زووتر بکوژرێت ئەوەندە باشترە.



ڕووداوەکانی دوای کارەساتەکەی شاری لتڵتۆن لە ئەمەریکادا کە هەندێکیان ڕووداوەکەی لتڵتۆن ئیلهام بەخشی بوون/ لە گۆڤاری (نیوزویك)ی ئەمەریکییەوە وەرگیراوە

لە ئەمەریکادا ڕێکخراوێك هەیە بەهەمان ناوەوەو نووسینگەی توێژینەوەی فیدراڵی بە یەکێك لە (١٠) ڕێکخراوە ئیرهابییە هەرە مەترسیدارەکانی ئەمەریکای داناوە [٥٥] .

## توندوتیژی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا

نکوڵی لەوە ناکرێت کە هەژاری و جیاوازیی گەورەی نێوان هەژاران و ساماندارانی لە هەندێك کات و شوێندا ململانەی توندوتیژیان لێ دەکەونەوەو ئەمە هەروەها بۆ پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و گەلانی هەژارو دەوڵەتان و گەلانی دەوڵەمەند ڕاستەو لەمەوە بەزۆری وڵاتانی هەژار دیاردەی (ئیرهاب) بەخۆیانەوە دەبینن بەڵام بینیشمان چۆن ئەم دیاردەیە تایبەت نییە بەو وڵاتانەو لە ڕۆژئاوای دەوڵەمەندیشدا هەبووەو هەیە. ڕەنگە لەوەش

سەیرتر بێت ئەگەر بزانین کە لە وڵاتێکی پیشەسازیی پێشکەوتووی وەك ژاپۆنیشدا ئەم دیاردەیە هەیە کە کەمتر وەکو وڵاتێکی توندوتیژ ناسراوە .

نموونەیەکی کۆنتری توندوتیژی لە ژاپۆندا (لەشکری سوور)ە کە ژمارەیەك کاری توندوتیژی ئەنجام دابوو. ئەو ڕێکخراوە نەیتوانیوە جەماوەر لەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوەو هەروەکو کۆمەڵێکی هەڵبژاردە (نخبوی) مایەوە بەڵام ئەمڕۆ جۆرە کۆمەڵی تر هەن. نموونەیەکی ئەو کۆمەڵانە کۆمەڵەی ئاوم شینریکیۆ Aum Shinrikyo(واتە راستیی باڵا)یە کە پیاوێك بەناوی شۆکۆ ئاساهارا دامەزرێنەرو پێشەوای رۆحیی بوو. شوێنکەوتووانی ئاساهارا بە دە هەزار کەس مەزەندە کرابوون (ئەم قسەیەش ساڵی ١٩٩٦ بوو). لە کارە سەیرەکانی ئەو کۆمەڵە ئەوەیە کلێتەی کارەباییان دەکردە سەریان بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باشتر پەیوەندی بە بیرە گەردوونییەکانی ئاساهاراوە بکەن [٥٦].

ئەو کۆمەڵە لە هێڵەکانی گواستنەوەی ژێر زەوی لە تۆکیۆی پایتەختدا گازی ئەعصابی جۆری (سارین)ی رشتو ئەمە بووە هۆی کوژرانی (١٢) کەسو زامداربوونی (٥٥٠٠) کەسیتر [٥٧] .جگە لەم کارەش ئاساهارا تۆمەت تری دابووە پاڵ[٥٨].

ئاساهارا دەیویست تۆکیۆ لەناوبەرێت و ئیمپراتۆری ژاپۆن لابەرێت و کۆتایی جیهان پێش بخات[٥٩]. پۆلیسی ژاپۆن لەبارەی کۆمەڵە ئاینییەکانەوە دەیوت کە بە درێژایی وڵات (١٨٠) هەزار کۆمەڵە هەن و ناتوانرێت چاودێریی هەموویان بکرێت [٦٠] (هەرچەندە ژمارەکە زۆرە بەڵام وا لە سەرچاوەکەماندا هاتووە).

ئەگەر بگەڕێینەوە ئەمەریکا دەبینین کە توندوتیژی دیادەیەکی بەرچاوی ئەو کۆمەڵگەیەیە، سەرژمێرییەکانی تاوان ژمارەی سەرنج راکێش دەخەنە روو. بۆ نموونە سەرژمێرییەکانی ساڵی ١٩٩٦ دەڵێن کە هەر (١٨) چرکە تاوانێکی توندوتیژی بەرپادەکرێت (واتە رۆژانە ٤٨٠٠ تاوانی توندوتیژی دەکرێن) و هەر پێنج خولەك تەعدایەکی جنسی روودەدات (واتە رۆژانە ٢٨٨ تەعدا)[٦١] ،نزیکەی (٢١٢) ملیۆن پارچە چەکیش لەبەردەستی هاوڵاتیانی ئەمەریکادا هەن [٦٢] . وەنەبێت هەڵگرتنی چەك نایاسایی بێت، چەك هەڵگرتن مافێکە دەستوور پارێزگاریی لێ دەکات و بەپێی تەعدیلێکی دەستووری رێگەی پێدراوە.

هەرزەکاران وکو گەورەکان توندوتیژی پیادە دەکەن: لە چەند رووداوێکدا هەرزەکاران مامۆستای خۆیان و قوتابیی تریان کوشتووە. لە یەکێك لەو رووداوانە (ساڵی ١٩٩٩) دوو قوتابی لە شاری لیتڵتۆن Littleton لە ویلایەتی (کۆلۆرادۆ)ی ئەمەریکیدا دوو قوتابی مامۆستایەك و دوانزە قوتابییان کوشت و (٢٣)ی تریان بریندار کردو پاشان خۆیان کوشت [٦٣]، لە شارێکی دیکەشدا چوار قوتابیی (١٤) ساڵان نەخشەیان بۆ تەقاندنەوەی قوتابخانەکەی خۆیان دانابوو[٦٤] ، پێنج قوتابیی تر بەهەمان تۆمەت گیرابوون[٦٥]،کوڕێکی (١٣) ساڵانەش بە دەمانچەو لیستی (٣٠) کەس کە شایستەی مردنن گیرا[٦٦].

هۆیەکی سەرەکیی ئەم توندوتیژییەی هەرزەکاران دەگەڕێتەوە بۆ سینەمای ئەمەریکی کە توندوتیژی بە رێژەیەکی زۆر گەورە دەهێنێتە بەرهەم و ئەو توندوتیژییە شکۆمەند دەکات. ئەمڕۆش لەوە خراپتر هەیە چونکە بەهۆی تۆڕی ئنتەرنێتەوە هەرزەکاران دەتوانن ئاگاداری دوایەمین بەرهەم و پڕوپاگەندەی توندوتیژی بن. دەشزانین لە بواری هونەردا فلمی توندوتیژیو کوشتارو وێران کردن رەنگدانەوەی ژیانی رۆژانەی هاوڵاتییانە بەڵام موبالەغە لە ئەندازەکەی دەکرێت و ئەم کۆکردنەوەی توندو تیژی لە بەرهەمێکی هونەریداو موبالغەکردن لە ئەندازەکەی جەماوەر دەورووژێنێت و توندوتیژی زۆرتر دەکات. سەیر نییە توندوتیژی بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سیاسی بەردەوام ئیدانە بکرێت لەکاتێکدا ئەو هەموو توندوتیژییە هونەرییە بخرێتە بازاڕ بێ ئەوەی بەری لێ بگیرێت. سەرچاوەی هەردوو توندوتیژییەکە جیاوازە، یەکەمیان لاواز بەرپای دەکات و دووەمیان بەهێز. یەکەمیان زیان بە سیاسەت و ئابووریی بەهێزەکان دەگەیەنێت و دووەمیان سەرچاوەی داهاتێکی زۆرە و کە بەشێك لەو داهاتە بەشێوەی باج دەچێتە قاسەکانی حکومەتی ئەمەریکی. یەکەمیان مومارەسەیەکی گەلانی ترە و دووەمیان بۆتە کەلتوورێکی نەتەوەیی رۆژئاوا وبەتایبەتی ئەمەریکا.

وەك وتمان تۆڕی ئنتەرنێت رەواجێکی گەورەتری داوەتە توندوتیژی چونکە دەستکەوتنی فلمی ئاسانتر کردووە جگە لە پەیوەندیی نێوان هەرزەکارەکان و دەستکەوتنی ئیعلاناتی توندوتیژی.. تاد لەرێگەی ئەو تۆڕەوە.

وەرزش بوارێکی دیکەی نواندنی توندوتیژییە. ئێمە دەپرسین: چەند کەس کاتێك تەماشای یاریی بۆکسێن دەکەن و خوێنی بۆکسەرەکان دەبینین گۆڕەپانە کۆنەکانی (رۆما)یان دێتەوە یاد کە تیایاندا کۆیلەکان بە چەك دژ بەیەکتر زۆرانبازییان دەکرد و کە لە هەندێك حاڵەتدا زۆرانبازییەکە مەرجی مردنی یەکێکیانی تێدا دەبوو؟ لەو ئاهەنگانەدا کۆیلەکان ئارەزووی ئەشرافی رۆما و هاووڵاتیانی تریان تێر دەکرد. ئەمڕۆش هەندێك لەم شتانە گۆڕاون. زۆرانبازان ئازادن بگرە قازانجێکی ماددیی گەورەش دەکەن. جەماوەریش تەنها ئەشراف نییە هەرچەندە پێویستە هەموویان پارە بدەن. ئەوەی لە وێنەکەدا نەگۆڕاوە رێکخەری زۆرانبازییە

كۆنەكەو وەرزشە نوێكەن كە قازانجی گەورەی خۆیان دەكەن ، هەروەها ئەوەی وەكو خۆی ماوەتەوەو نەگۆڕاوە گیانی توندوتیژی كە جەماوەری پێ دەورووژێنرێت و كە جەماوەر خۆی بەدوایدا دەگەڕێت.

وەنەبێت وەرزشی توندوتیژ تەنها بۆكسێن بێت بەڵكو بەشی زۆری وەرزشەكان توندوتیژن و كامیان توندوتیژترە ئەوەیان زیاتر سەرنج ڕاكێشترە.

## شارستانیی توندوتیژی

كەواتە ڕۆژئاوا شارستانیی توندوتیژیی بنیات ناوە. شۆڕشی پیشەسازی ئیقاعی ژیانی ڕۆژئاوایی‌ی خیراترو توندوتیژتر كرد، ئەم ئیقاعە ڕەنگی لە كەسایەتیی ڕۆژئاوایی داوەتەوە. لەمیانەی پەلەكردن و هەڵپەی ژیانیشدا مرۆڤی بێهێز بەجێ دەمێنێت، بەڵكو دەشكەوێتە ژێرپێوە. هەموو ئیجرائە كۆمەڵایەتییەكانیش وەك زەمانەتە تەندروستییەكان و زەمانەتی بێكاری ...تاد تەنیا ڕواڵەتی ئەمانە تەعدیل دەكەن بەڵام دەستكاریی كرۆكی ژیانی ڕۆژئاوایی ناكەن.

ڕۆژئاواییەكان لە ناچارییان بۆ پەلەكردن و پاڵەپەستۆ كردن پەنا بۆ ئەنیشك دەبەن [٦٧]. بۆیە دەتوانین باس لە (شارستانیی ئەنیشك) بكەین. لێرەوە یەكێك لە هۆكارەكانی توندوتیژیی ڕۆژئاوایی دەزانین (واتە ئیقاعی خێراو توندوتیژیی ژیانی ڕۆژانە). پێشتریش هۆكارێكی دیكەمان زانی ئەویش كاری دەزگا ئیعلامییەكان لەسەر برەودان بەو توندوتیژییە. لەم دوو هۆیەشەوە دەتوانین هاوكێشەیەكی توندوتیژیی ڕۆژئاوایی دابنێین:

ژیانی كۆمەڵایەتی ——→ توندوتیژی ⇄ گوزارشت لە توندوتیژی

بە واتایەكی تر ژیانی كۆمەڵایەتی توندوتیژی دەهێنێتە بەرهەم، ئەم توندوتیژییەش بە شێوازی جۆراوجۆر تەعبیری لێدەكرێت بەڵام ئەم گوزارشت كردنە توندوتیژیی زیاتری لێدەبێتەوە. مەرجیش نییە ئەم گوزارشت كردنە لە ڕێگەی فلمەوە بكرێت بەڵكو تەنانەت بڵاوكردنەوەی تاوانەكان و كارەكانی توندوتیژی وەكو هەواڵ لە ڕۆژنامە و گۆڤاردا ئەم تاوان و كارانەی توندوتیژییە بەرەبەرە دەكاتە مەسەلەیەكی ئاسایی، بەپێی یاسای لاسایی كردنەوەش ئەم بڵاوكردنەوەیە هانی كەسانی تر دەدات بۆ ئەنجامدانی تاوانی هاوشێوە.

شێوازێكی دیكەی گوزارشت كردن لە توندوتیژی بریتییە لە بواری فیكر. لە ئەنجامی ئیقاعی توندوتیژی ژیانی كۆمەڵایەتی و ململانە كۆمەڵایەتییەكان و جەنگە دەرەكی و ناوخۆییەكان..تاد، بۆچوون و فەلسەفەی جیاجیا دێنە گۆڕێ. لەناو ئەو بۆچوونانە ڕەوتێكی توندوتیژی دەبینرێت كە تەركیز لەسەر ململانە دەكات. بە پێی هاوكێشەكەی سەرەوەشمان ئەو بیروبۆچوونانە جارێكی تر دەگەڕێنەوە جەستەی كۆمەڵگەو توندوتیژی زیاتریان لێ دەكەوێتەوەو لەمەش گرنگتر: شەرعییەت بە توندوتیژی دەدەن و زەمینەیەكی نەزەری و فیكری بۆ ئەو توندوتیژییە بینا دەكەن.

لەمەوە دەتوانین تا ڕادەیەكی گەورە لە سەرهەڵدان و تەفسیری بیرۆكە قەومییەكان و بیرۆكە سۆشیالیستەكانی وەكو ماركسییەت و بلانكییەت و فەوزەوییەتی كۆمۆنیست هەروەها بیروبۆچوونی وەك ئەوەی (نیتشە) تێ بگەین كە توندوتیژیی ژیانی كۆمەڵایەتی سەرچاوەیەكی سەرەكییانە بەڵام بۆ خۆیان ئەو توندوتیژییەیان خەست تر كرد.

بۆچی ئەوەندە لەسەر توندوتیژی ڕۆیشتین هەرچەندە مەرج نییە توندوتیژی و ئیرهاب هاوجووت بن و ئێمەش لە ئەسڵدا لە بارەی ئیرهابەوە دەدوێین نەك توندوتیژی؟

لە ڕاستیدا ئیرهاب وەكو یەكێك لە كارەكانی توندوتیژی پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ڕەگەكانی توندوتیژی و تەنها نەگەڕێتەوە بۆ هۆكارە سیاسی و ئابووری و ئایینییەكان...

لەمەش گرنگتر دەمانەوێت جیاوازیی نێوان ئیرهاب و جیهاد بزانین. ناسینی ڕەگەكانی توندوتیژیی ڕۆژئاوایش ئەمەمان بۆ ئاسان دەكات.

## جیهاد و توندوتیژی

ئەمڕۆ هەوڵێك بۆ یەكسان كردنی جیهاد بە ئیرهاب هەیەو ئەم هەوڵە تا ڕادەیەك سەركەوتنی بەدەست هێناوە. بەڵام توندوتیژیی جیهاد و توندوتیژیی ئیرهابی چ جیاوازییەكیان لە نێواندا هەیە؟

سەرەتا با باس لە توندوتیژییەكانی ڕۆژئاوا بكەین و جیاوازییەكەیان لەگەڵ جیهاددا بكەین.

جیهاد ئەسڵی شەرعیی خۆی هەیەو حوکمی فیقهی لە بارەوە هەیە، واتە کارێکە پێشتر رووە ((قانوونییەکانی)) ئاشکراکراون لەکاتێکدا توندوتیژیی رۆژئاوایی زیاتر بەرهەمی ژینگەی رۆژئاوایە لەبەر ئەوە رووە نەزەرییەکەی دواتر دێت و کەم تا زۆر واقعەکە خۆی بەسەریدا دەسەپێنێت.

جیهاد ئەحکامی شەرعی و بنەمای ئەخلاقیی خۆی هەیە لەکاتێکدا توندوتیژیی رۆژانە بریتییە لە غەریزە. جیهاد ئەو غەریزەیە دەکاتە چالاکییەکی مرۆڤانە و ئامانجی بەرزی پێ دەبەخشێت. جیهاد مەبەستی ئیسلامی دەهێنێتە دی: لابردنی تاغووتەکان و تەخت کردنی رێگا بۆ ئەوەی جەماوەر دوور لە فشار و ترۆقاندن و پڕوپاگەندە و خەڵەتاندن بە مادده و سامان لە لایەن تاغووتانەوە گوێ بۆ راستییەکانی ئیسلام بگرن.

ئیسلام ئەو ئایینە واقعییەیە کە دەزانێت بەهێزەکان ئازادی دەست نیشان دەکەن و سنووری بۆ دادەنێن، لەبەر ئەوە چاوەڕێی ئەوە ناکات لە هەموو شوێنێکدا رێگە بە ئازادیی بانگەواز بۆ ئیسلام بدرێت بۆیە خۆی بۆ ئەو حاڵەتە ئامادە دەکات. ئەمەش زۆر بە سادەیی فتوحاتی ئیسلامیمان بۆ روون دەکاتەوە: ئەو وڵاتەی کە لەشکری ئیسلامی رووی تێدەکات یەکێك لە سێ رێگە هەڵدەبژێرێت: موسڵمان بوون، یان مانەوە لەسەر ئایینی خۆی بەڵام پێدانی جزیە و یان شەڕ.

جیهادیش بەم شێوەیە رێگە لە بەردەم بانگەوازەکەی خۆیدا خۆش دەکات، زۆرەملێ لە بڵاوکردنەوەی ئاین بەکار ناهێنێت بەڵام هەروەها کۆسپەکانی لەبەردەم بانگەواز بۆ ئاینەکە ناهێڵێت.کاتی بەرپاکردنی جیهادیش پێویستە موجاهیدان رەوشتی ئیسلامی بپارێزن وەك لە بەشی یەکەمی ئەم باسەماندا ئاماژەمان بۆ کرد. جیهاد بە کورتی شێوازێکی توندوتیژییە کە خاوەنی بنەمای شەرعی و ئەخلاقیی خۆی هەیە.

## جیهاد و عەولەمە

وەکو رەخنە باس لە فتوحاتی ئیسلامی و ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکرێت. ئەمانەش بۆیە قبوڵ نەدەکران و ناکرێن چونکە کەسانی تر پێ هەڵدەستان بەڵام ئەمڕۆ ئەوەی ئەمانەی قبووڵ نەدەکرد هەر خۆی غەزوێکی ئابووری و فیکری و ئەخلاقیی جیهان دەکات وەك چۆن پێشتر غەزوێکی هاوشێوەی جیهانی کردبوو و زۆر جار غەزویی سەربازیشی پیادە دەکرد.

عەولەمە غەزوێکی نوێیە، هەر کەسێکیش بۆی بلوێت لێی دانانیشێت و غەزوی جیهان دەکات. عەولەمە نوێترین غەزوە و لایەنە بەهێزەکە پێی هەڵدەستێت. زانایەکی سیاسیی ئەمەریکی بە ناوی (بنیامین باریەر) دەڵێت کە ئیسلامی ئوسوڵی تاکە هێزی بەرهەڵستکاری عەولەمەیە. نووسەر دەیەوێت بڵێت دوو هێزی دژ بەیەك لە جیهاندا هەن. هەرچەندە کابرا دەڵێت جیهاد و ماك وۆرڵد (مەبەستی نووسەرێکی ئابوورییە کە باسی لە عەولەمە کردبوو) پێکەوە جێ بە دەوڵەت ( یان نەتەوە) و بناغەکانی دیموکراسی لەق دەکەن بەڵام دان بە شتی باش زۆری جیهاد دەنێت چونکە بۆ نموونە رەخنە دژ بە کۆمەڵگەی ئیستهلاکی پێشکەش دەکات.(٦٨)

جیهادی سنوور بەزێن لەراستیدا پاساوی شەرعیی تری هەیە بەڵام ئەگەر نەیارانی بیانەوێت پاساوی بۆ نەهێڵن و پێوانەکانی خۆیان بەکاربهێنن جیهاد دەتوانێت هەر ئەو پێوانانەی خۆیان لە دژیان بەکار بهێنێت. دەنا بۆچی ناردنە دەرەوەی ئیسلام لە رێگەی جیهادەوە رەوا نەبێت بەڵام ناردنە دەرەوەی دیموکراسی و بەزۆر سەپاندنی ئەو و سەرمایەداری بەسەر گەلاندا رەوابێت؟ بۆچی جیهادی جیهانی رەوا نەبێت و عەولەمە رەوا بێت؟ ئەم سەردەمە خۆی پاساو بۆ جیهادی جیهانی دەدۆزێتەوە.

## شۆڕشی جیهانی

کاتێك فیکرەی سۆشیالیزم و بە تایبەتی مارکسییەت رەواجی هەبوو، شۆڕشی جیهانی فیکرەیەکی هاوڕێی مارکسییەت بوو. لە جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا لە سییەکانی سەدەی بیستدا خۆبەخشی چەپرەو لە شوێنی جیاجیاوە روویانکردە ئەوێ تا لە ریزی بەرەی کۆماریدا دژی هێزەکانی جەنەراڵ فرانکۆ بجەنگێن . جگە لەم هاوکارییە نێو نەتەوەییە جاروبار چەپرەوان دەچوونە ئەم وڵات و ئەو وڵات تا لە ریزی شۆڕشدا بجەنگێن. (گیڤارا)ی هاوڕێی کاسترۆ بە ئەسڵ ئەرجەنتینی بوو، ئەو ئەرجەنتینییە لە ریزەکانی شۆڕشی کوبادا شەڕی کردو پاشان رووی کردە وڵاتێکی تری ئەمەریکای لاتینی و لەوێدا کوژرا.

پێشتریش شۆڕشی جیهانی باوەڕێکی کۆمۆنیستەکانی یەکێتی سۆڤییەت بوو، کۆمۆنیستەکانی ئەوێ باوەڕیان وابوو سەرکەوتنی ئەزموونی سۆڤیتی لە رووسیادا بەندە بە شۆڕشی سەرتاسەریی کرێکارانی ئەورووپا. بەڵام پاش ئەوەی شۆڕشەکە رووی نەدا بیرۆکەیەکی دیکە خرایە کار ئەویش بنیات نانی سۆشیالیزم لە یەك وڵاتداو پاشان گواستنەوەی بۆ وڵاتانی تر.

لەگەڵ هەرەسی کۆمەڵەی وڵاتانی کۆمۆنیست و دارمانی رژێمەکانیان بیرۆکەی شۆڕشی جیهانی کە پێشتر لە گیانەلادا بوو بە روالەت وا دەرکەوتبوو کە بە تەواوی گیانی لەدەست داوە بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو شۆڕشێکی جیهانی لە شێوەیەکی تر سەری هەلدا.

سالی ١٩٨٩ سالی دارمانی نیزامە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای رۆژهەلات بوو و لە هەمان سالدا و پاش زیاد لە دە سال لە داگیرکردنی ئەفغانستان یەکێتی سۆڤیێت لەو وڵاتە کشایەوە. بەهاری ١٩٩٢ سەرکەوتنی تەواوی موسلمانانی ئەفغانستان بوو بەسەر نیزامە وابەستەکەی مۆسکۆ و پاککردنی وڵات لە کۆمۆنیزم، زۆریش نەبوو یەکێتی سۆڤیێت هەرەسی هێنابوو و هەلوەشابووەوە.

بە درێژایی ی سالانی جیهادی ئەفغانستان هەزاران موجاهید لە هەموو وڵاتەکانی جیهان روویان کردە ئەو وڵاتەو فیکرەی شۆڕشی جیهانی زیندوو کرایەوە. ناوچەیەکی ئەفغانستانیش نەما گۆڕی موجاهیدێکی جیهانی ئیسلامیی تێدا نەبیت.

سالی ١٩٩٣ ش پێشەنگەکانی موجاهیدانی جیهانی روویان کردە بۆسنەو کۆمەلێکی تر گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، کۆمەلێکی تر روویان کردە وڵاتانی تری ئیسلامی کە دوایەمینیان چیچان بوو.

ئەفغانستان جیهادی زیندوو کردەوەو لەهەمان کاتدا شۆڕشی جیهانیشی بۆ جارێکی تر هێنایە بوون. هەردوو جیهادو خەباتی جیهانی جێگەی مەترسیی گەورەن بۆ زلهێزەکان و بۆ نیزامەکانی وڵاتانی ئیسلامی.

جیهادی ئەفغانی گەورەترین سەروەریی تۆمار کرد بەلام دوایی لە سککەی خۆی دەرچوو و بووە فتنەو شەڕی ناوخۆ. لەگەل ئەوەشدا گەورەترین بەرهەمی لە دوای خۆیەوە جێهێشت ئەویش سەلماندنی هێز و توانای جیهاد. جیهادی میللەتێکی رەش و رووت بەسەر هێزی ماددیی زەبەلاح کە دووەمین دەولەتی جیهانی بوو.

نێوان هەرەسی رژێمە کۆمۆنیستەکان و لەگۆڕنانی تەواوەتیی بیرۆکەی شۆڕشی جیهانی و سەرهەلدانی جیهادی جیهانی زەمەنێکی ئەوەندە کورت بوو کە دەتوانین بلێین زەمەن نەبوو. دەتوانین هەردوو رووداوەکە بە سالی (١٩٨٩) یان (١٩٩٢) تۆمار بکەین. کام سالیشیان بێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە مردن و ژیانەوەکە هاوکات بوون.

جیهادی جیهانی مەترسیدارترە بۆ زلهێزەکانی چونکە لاوترە، کاریگەرترە، بە هۆی عەقیدەی ئیسلامیشەوە شەرعیەتی لەناو جەماوەردا ئاشکراترە.

زلهێزەکان مەبەستیانە خەباتەکان پارچەپارچە بکەن تا یەك یەك نەیانهێلن چونکە تەقینەوەی جیهاد لە هەموو شوێنێکدا و هاتوچۆی موجاهیدان لەنێوان وڵاتەکاندا بۆ ئەوان کارەساتێکی گەورەیە. چەکێکی دەستی ئەوانیش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەترسییە جەنگی ئیعلامییە بۆ ناشیرین کردنی جیهادی جیهانی. بەلێ" کەموکورتی هەن و هەلەی زۆر دەکرێن بەلام ئەسلی ئامانجەکە گەورەو پیرۆزە، موجاهیدیش ئاوڕ لە قسەی ناشیرین ناداتەوە (**يجاهدون في سبيل الله ولا يخافون لومة لائم**). ئەو رۆژەش کە جیهاد لە زۆربەی وڵاتاندا دەتەقێتەوە بوومەلەرزەی گۆڕانکاری سەرتاپای جیهان دەگرێتەوە. هەتا ئەگەر جیهاد لە هەموو شوێنەکانیشدا لە یەك ساتەوە نەتەقێتەوە وەلاتێك هەر دەبێت پێشەوایەتیی جیهادی جیهانی بکات. هەموو رێگەکان دەمانگەیەننە رۆما.

## هێز رێزە

جەنگی ئیعلامی سازدراوەو جیهاد بە ئیرهاب ناوبراوە، ئەی دەبێت ئیسلامییەکان چی بکەن؟ واز لە ئامانجەکانیان بهێنن و چاوەڕێی زەلیلی بکەن؟ چاوەڕێی هێزەکانی دیکە بکەن لە دەرگاوە بێت یان لە پەنجەرەوە بێنە مالەکەیان؟ لە پەراوێزی ململانەی جیهانی لەسەر دەسەلات بمێننەوەو ببنە دیشلێکی بچووکی ناو مەکینەی دەولەتێکی بەهێز تا بۆ سەروەری و دەولەمەندکردنی خۆی بیانسووڕێنن؟ مرۆڤی ژیر هیچ لەمانە ناکات و لەبەر قسەلۆك دەستبەرداری وەسیلەکانی بەهێزبوون نابێت.

هێز سەلماندوویەتی کە دروستکەری پێوانەکانە، یاسای نێودەولەتی و عورف و دابونەریتی نێوان دەولەتان ومافی مرۆڤ و دژایەتی کردنی توندوتیژی...تاد لە سنوورێکی دیاریکراودا کاری خۆیان دەکەن بەلام لەبەردەم هێزدا چۆك دادەدەن. هێز تەنانەت رێزیشت بۆ دروست دەکات. ئەم راستییە ئەوەندە بەدیهییە کە رەنگە یەك تاکە نموونە بۆ سەلماندنی ئەمە پێویست نەبێت بەلام لەگەل ئەوەشدا با نموونەی بۆ بهێنینەوە:

(دۆگلاس براڤۆ) کە سەرکردەیەکی چەپڕەوی (ڤێنزویللا) لە ئەمەریکا لاتینیدا بوو دەلێت کە رۆژی نەمانی حوکمی دکتاتۆری وڵات پێریز خیمینیز سالی ١٩٥٨ نزیکەی سەد دەمانچە هەلگر لە شەقامەکانی (کاراکاس)ی پایتەخت بووین. ئەو کاتە دەسەلاتداران ئێمەیان بە هاوشانی خۆیان دەزانی و بە شایستەیان دەزانین وتووێژمان لەگەلدا بکەن. حکومەت (گۆستاڤ ماچادۆ) ـ

کە سکرتێری گشتیی حزب بوو ـ ی بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی بانگهێشت دەکرد بەڵام کە دواتر دەمانچەکانمان دانا دەرگای کۆشکەکە بە رووی (ماچادۆ)دا داخرا[٦٩].

مەبەستی دەسەڵاتداران چەك کردنی نەیارانە، مەبەستی زلهێزەکانیش چەك کردنی هەردوو بەهێزەکانی تر و بێهێزەکانە. ئەگەر چەکیش گرنگ و مایەی رێزو دروستکەری دەسەڵات و سامان نەبوایە ئەمەریکا هەوڵی نەدەدا پەیمانی (ناتۆ) فراوانتر بکات. دەبوایە پاش هەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیێت و پەیمانی (وارشۆ) کە جێگەی مەترسی بوون بۆ رۆژئاوا پەیمانی ناتۆش هەڵبوەشێنرایەوە. ئەمەریکا و غەیری ئەمەریکا شارەزای گەمەکەن بەڵام تەنها ئەمەریکا سەرکەوتووانە پیادەی کردووە، ئەمەشی بۆ لواوە.



موسڵمانی ئەمڕۆ چیتر ئەو موسڵمانە لاوازو دەستەوەستانەی جاران نییە

وابزانم جێگەی خۆشیەتی باس لە دوو وێنەی جیای موسڵمان بکەم تا خوێنەری بێ لایەن ئەگەر خرانە بەردەمی بە کامیان رازییە بۆ خۆی هەڵیبژێرێت. یەکەمیان هی زیاد لە بیست ساڵ بەر لە ئێستا بوو. کاتی خۆی مارکسییەکان و قەومییەکان رێگەی خەباتی چەکدارییان گرتبووە بەرو رەخنەیان لە ئیسلام دەگرت کە گوایە مرۆڤ فێری سلبیەت و تەسلیم بوون بە ئەمری واقیع و زوڵمی زاڵمان بێت.

دیمەنێکی ئەو رۆژانە زۆر دووبارە دەبووەوە" لاوە موسڵمانەکە کڵاوێکی سپیی لەسەردا بوو، هێمن و لەسەرخۆ بۆ مزگەوت دەرۆشت، لاوە مارکسی و قەومییەکان و لاوە بەرەڵا (بێ فیکرە)کان رێگەیان پێ دەگرت، هەڕەشەیان لێ دەکرد، سووکایەتییان پێ کرد، ئەویش تف و کەرامەتیی خۆی قووت دەدا و بێدەنگ دەبوو، بەڵام ئەمڕۆ لاوەکە کڵاوە سپییەکەی بێ وەییی فڕێداوە و ریشی لێ درێژ کردووە، بەعیزەتەوە بەسەر زەویدا دەڕوات، چەکی هەڵگرتووە. ئا ئێستا ئەو لاوە جێگەی مەترسییە. مەرە بێ وەیەکە گۆڕاوە. خوێنەری بێ لایەن: کامیانت پێ باشترە؟ لای ئێمە هەردووکیان باشن بەڵام دووەمیان باشترە (المؤمن القوي خيرٌ واحبُّ الى الله من المؤمنِ الضعيف وفي كلّ خير) ئیمانداری بەهێز لای خودا باشترو خۆشەویستترە لە ئیمانداری لاوازو هەردووکیان خێریان تێدا هەیە (موسلم روایەتی کردووە/صحیح مسلم/کتاب القدر).

ناحەزانمان دەیانەوێت ببینە مەرە بێ وەیە کڵاولەسەرەکە تا بە ئاسانی سەرمان ببرن. لە بۆسنەدا حوکمی یوگۆسلاڤی موسڵمانەکانی لە ریزی سوپادا قبووڵ نەدەکرد بۆیە موسڵمانان لە بواری سەربازی وشەڕدا تواناو شارەزاییان نەبوو و هەربۆیەش کاتێك چەکدارە سربەکان لە شارێك یان گوندێکی موسڵماننشین نزیك دەبوونەوە موسڵمانەکان لەرزیان لێ دەهات و دەتۆقین.ئەوەندەی پێ نەچوو موجاهیدە جیهانییەکان گەیشتنە بۆسنەو موسڵمانەکانی بۆسنەیان بینی چۆن و لە کێ دەترسن. ئەو جەنگاورە لێهاتووە ((ریشدارانە)) بۆ سربەکان هاتنە مەیدان و وەکو عەرەب دەڵێن (لايَفلّ الحديد الا الحديد) تەنها ئاسن ئاسن دەشکێنێت کەوتنە شکاندنیان و کەلاکیان لێ خستن و شەڕەکانیشیان بە کامێرای ڤیدیۆ گرت و وێنەکانیان پیشانی موسڵمانەکانی بۆسنە دا" ئەوەتا فیشەك لاشەی سربەکان دەبڕێت ئینجا موسڵمانەکانی بۆسنە باوەرو متمانەیان بەخۆ بۆ دروست بوو.

## کۆمەڵەی سەرخراو

زۆرن ئەو فەرمودانەی باسی ئەو کۆمەڵە دەکەن کە خودا سەریان دەخات و تا رۆژی قیامەت وجوودیان هەیە. زووتر هەندێك زانا ئەم کۆمەڵەیان بە ئەهلی فەرمووەدە دەزانی، بەڵام فەرموودەی تر باس لەوە دەکەن کە ئەمانە شەڕ دەکەن لە کاتێکدا ئەهلی فەرموودە شەڕکەر نین. ئەگەر ئەو کۆمەڵە کۆمەڵێکی دیاری کراو نەبن و دەشێت موجاهدو زاناو بانگخواز... بن ئەوا جەنگاوەرانی جیهادی جیهانی کۆمەڵێکن لەوانە. ئەمانە کەسوکارو وڵاتی خۆیان جێهێشتووەو روویان کردۆتەوە هەر وڵاتێك جیهادی تێدایە.

ئەمانە غەیری هەژاری لە دنیادا هیچیان دەست نەکەوتووە، هەر ئەم موجاهیدە هەژارانەشن ـ وەك فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) باس لەمە دەکات ـ کە بەر لە هەموو کەسێك لەقیامەتداو لەو رۆژەی هەموو ئەهلی مەحشەر تینوویانە دەگەنە سەر حەوزی پێغەمبەر(ﷺ)و لیّی دەخۆنەوە.ئەمە ئاواتی ئەو موجاهیدانەیە ئیتر دەبێت قسەو قسەڵۆك چەندی کاری لەسەریاندا هەبێت و چۆن ناوو ناتۆرەی وەکو (ئیرهابی) دەیانترسێنێت؟ ئێمەی ئیسلامیو ناحەزانمان لەهەوڵ وکارکردنداین، لەدوارۆژیشدا یەکتر دەبینینەوە.

# پەراوێزو سەرچاوە

١- صحيح مسلم/ كتاب العلم.

٢- صحيح مسلم/ كتاب الايمان.

٣- بڕوانە: د.عبدالوهاب الكيالى وهاوڕێكانى، الموسوعة السياسية، المؤسسة العربية للدراسات و النشر ج١،١٩٧٩ ل ١٥٣.

٤- پێناسەی (بریان کرۆزییێر) نووسەری کتێبی الثائرون The Rebels وەرگێڕانی: خیری حماد، المکتب التجاری، بیروت ١٩٦١، ل ١٩٢، بەڵام نووسەر بەشێوەکی کاتی ئەم پێناسەیەی دانابوو.

٥- الجنرال كارل فون كلاوزفيتز، فى الحرب،ت.اكرم ديرى والهيثم الايوبى، بيروت ١٩٧٤، ل ٨٩

6- J.B.S. Hardman, Terrorism, in, Encyclopaedia of The Social Sciences, Vol. 14, New York, 1934, (13th reprint. 1959, p. 575

.lbid, p.576 -٧

8- Richard Niebuhr, Fundamentalism, in, Encyclopaedia of the Social Sciences, Vol. 6, 1931) 13th reprint. 1959), p.526.

lbid

١٠- احمد ثابت ، قضية لوكربى ومستقبل النظام الدولى (تاليف مجموعة من الخبراء والباحثين) ١٩٩٢، ل ١٢٣ بەدواوە.

١١- رۆبەرت پاڵمەر، ١٧٨٩، الثورة الفرنسية وامتداداتها (ناوی ئەسڵی:١٧٨٩ شۆڕشەکانی ئازادی ویەکسانی) ت.هنرييت عبود ١٩٨٢، ل ١٦٠.

١٢- فرانز ميهرنغ (مێرنگ)، كارل ماركس، تاريخ حياته ونضاله، ت.خليل الهندى، ١٩٧٢، دار الطلبة، بيروت، ل١٥٦.

١٣- ب. کرۆزییێر، الثائرون، ل ١٦١.

١٤- بۆ ئەم قسەیەی ئیسپۆزیتۆ بڕوانە: گۆڤاری الدبلوماسی، ژمارە٣، ساڵی یەکەم، تشرینی یەکەم ١٩٩٦، ل ٩.

١٥- الدكتور يوسف القرضاوى، الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف، ل ٣٦.

١٦- گۆڤاری المجتمع ژمارە ١٠٥٥، ١٩٩٣/٥/٢٩ ل ٢٩.

١٧- ريجى دوبريه، دفاعاً عن الثورية، ت. نزيه الحكيم، دار الاداب ، بيروت، چاپی دووەم، ئابی ١٩٧٢، ل ٢٦.

١٨- لیۆن ترۆتسکی، الارهاب والشيوعية، ت.جورج طرابيشى، دار دمشق، (ئەسڵەکە ساڵی ١٩٢٠) ساڵی وەرگێران؟ ل ٦٧.

١٩- سەرچاوەی سەرەوە ل ١٢٩

٢٠- د.فاضل صبحى، كومونة پاريس، ١٩٥٩، ل ٣٧.

٢١- ريجى دوبريه، دفاعاً عن الثورية، ل ٧٧.

٢٢- گۆڤاری قضايا دولية، ٣٣٠، ٢٩ ، ١٩٩٦/٥/٥ ل ٢٣ ئەویش لەرۆژنامەی (الشعب)ی میسری ١٩٩٦/٤/٥ وەرگیراوە.

٢٣- فادی اسماعیل، لەگۆڤاری الدبلوماسی، تشرینی یەکەم ١٩٩٦ ل ٢٧. رۆژنامەی (تابلۆید) رۆژنامەی قەبارە بچووکەو بەزۆری وێنەی تێدایە لەگەڵ هەواڵی کورت.

٢٤- دكتۆر انس الشيخ على، گۆڤاری الدبلوماسی، تشرينی يەكەم ١٩٩٦، ل ٣٣.

٢٥- سەرچاوەی سەرەوە.

٢٦- سەرچاوەی سەرەوە.

٢٧- بڕوانە هاوڕێ باخەوان، (هاوڕێنامە) بۆ مێژووی كوردستان وكورد، لەبڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩.

٢٨- هاوڕێنامە، ل ٣١٣.

٢٩- هاوڕێنامە، ل ٣٢٥.

٣٠- گۆڤاری المشاهد السياسی، ژمارە ٣٨، ١-١٢/٧/١٩٩٦، ل ٢٣.

٣١- گۆڤاری المشاهد السياسی، ژمارە ٩٧، ل ١٦-١٧.

٣٢-گۆڤاری قضايا دولية، ژمارە ١٦٦، ١/٦/١٩٩٧، ل٥.

٣٣- بڕوانە كتێبی حوار الدولة و الدين، المركز الثقاف العربي، ١٩٩٦ كە حيواری نێوان (د. سەمير ئەمين) و (برهان غليون)ە. بڕوانە بۆ نموونە ل١٢٥ بەدواوە ول١٨٣ و رەخنەی (برهان) لە (د.سەمير).

٣٤- بۆ ئەمە بڕوانە كتێبی قضية لوكربی...، ل ١٠ بەدواوە.

٣٥- بسام العسلی، نهج الثورة الجزائرية، بيروت، چاپی دووەم، ١٩٨٦، ل ١٤٨.

36- V. Cygielman, La Nouvel Observateur, 12-20/ 3/1996, p. 50.

٣٧- الفرد ليلنتال، هكذا يضيع الشرق الاوسط، ت ؟ بيروت، ١٩٥٧ ل ٢٤ بۆ قەسابخانەكەش بڕوانە هەروەها: بسام ابوغزالة، الجذور الارهابية لحزب حيروت الاسرائيلی، بيروت، ١٩٦٦، ل٤٦-٤٧.

٣٨- گۆڤاری الدبلوماسی، ژمارە ٤، شوباتی ١٩٩٧، ل٢٥.

٣٩- بارنغتون مور، الجذور الاجتماعية للدكتاتورية والديمقراطية، ت. جورج جحا، بيروت، ١٩٧٣، ل١١٤.

٤٠ - ئەو قسەیە لە: ربيع الحافظ، گۆڤاری السنة، ذو الحجة ١٤١٥، ل١٤.

41- Jean – Paul Mari , Gaza, La chase aux terroristes, Le Nouvel Observateur, 12-40\3\1996, P.49.

٤٢- اميل برهييه، تاريخ الفلسفة، القرن السابع عشر، ت. جورج طرابيشی، بيروت، ١٩٨٣، ل ٣٢٩.

٤٣- هەمان سەرچاوە.

٤٤- الكيالی، الموسوعة السياسية، ل ٢١٧- ٢١٨.

٤٥- فتح الباری بەرگی ١٤، چاپی دار الفكر، ١٩٩٧، فەرمووده ژمارە ٧٠٥٤، ٧٠٥٥، ٧٠٥٦.

٤٦- ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ئەم قسەیەم هەر لە (فتح الباری)دا بینیوە بەڵام ئێستا بەرگ و لاپەڕەكەم لەبەردەستدا نییە.

٤٧- الكيالی، الموسوعة السياسية، ل ٢١٧.

٤٨ سەرچاوەی سەرەوە.

49-Michel Colomès, la vrai visage des pourvoyeurs de haine, le Point, 1180, 29\4\1995, p.71

50- Ibid, p.70.

51-Ibid.

52-H. Pardes, A. West,H. Alan Pincus, Physicians and the Animal – Rights Movement, The New England Journal of Medicine, Vol. 324, No. 23, June 6,1991, p.1640.

53-Ibid,p.1641.

54- Ibid.

55-Ibid,p.1642.

56-Henri Haget,Il voulait faire sauter la Planète,l'Express,25/4/1996,p.23.

57-Ibid.

58-Ibid,p.23 .

59-Ibid,p.30 .
57-Ibid .
٦١-گۆڤاری المجتمع، ژ١٢٢٢، ١٩٩٩/١٠/٢٢، ل٢.
٦٢-ربيع الحافظ، گۆڤاری السنة ، ژ٤٨، ل٤٤.
٦٣-بڕوانە هەردوو ژمارەی رۆژی ١٩٩٩/٥/١٠ی هەردووگۆڤاری (تایم)و(نیوزویك)ی ئەمەریکی لەبارەی ئەو کارەساتە.
64-Time,10/5/1999,p.53.
65-Ibid.
66-Ibid .
٦٧-ئەمەم لە گۆڤارێکی عەربیدا بینیوە کە ئیستا لەبەر دەستمدا نییە.
٦٨- چاوپێکەوتنێك لە گوڤاری المشاهد السیاسی ژمارە١٢،٢٠٩-٢٠٠٠/٣/١٨،ل١٣-١٤.
٦٩- ریجی دوبریە، دفاعا عن الثورية، ل ١٦١-١٦٢.